ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)
نووسینی: عــەلی بـــاپیر
مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر
چاپی دووەم ٢٠١٨ز- ١٤٣٩ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ،
عەلی بـــاپیر (نووسەر)،
٢٧٥ لاپــەڕە ،
١٧* ٢٤ سم ،
بابـەت ، ئـایینی
تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٦٤٤ ) ی ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە.

ISBN: 978-9933-593-28-2

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ** : نـــەوزاد کۆیـــی
**دیزاینی ناوەوە و بەرگ** : زەردەشت کاوانی

# پێناسە و پێویستیی و گرنگیی
# ڕێبازی
# پێغەمبەری خوا ﷺ

نووسینی

عەلی باپیر

## پێشکەش بێ

بەهەر کەسێك بەردەوام لە هەوڵی قووڵتر و باشتر ئاشنابوون بە پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) و شارەزابوونی ڕێبازەکەی دایە، تاکو بتوانێ چاکتری جێ بەجێ بکات لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی دا.

# پێشــەکی چاپی یەکەم

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْــتَعِينُهُ، وَنَسْــتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِــنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِــلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب

أَمّا بَعد: فَإِنَّ أَصْدقَ الحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْيِ هَديُ مُحَمَّد صَلَّى اللّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ في النّار.

**خوێنەری سەنگین!**

ئەم کتێبەی بەردەستت لەدوو بەش پێك هاتوە[١]، **بەشی یەکەمیان:** لە ئەسڵ دا وتارێکی بەندە بووە، کە لە هۆڵی (بۆنەکان) لە شاری (ڕانیە)ی دەروازەی

---

(١) ئەوە لەچاپی یەکەمی دا.

ڕاپەڕین، لە کۆڕێك دا بە ناوونیشانی: {چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)}، دراوەو، پاش هێنانە سەر کاغەز، لەلایەن چەند برایەکی دڵسۆزەوەو، چاوپێداگێڕانەوەی خۆم، بەمجۆرەی لێهاتوە.

**بەشی دووەمیشیان:** (چۆن شوێن ڕێبازی پێغەمبەر بکەوین؟!)، باسێکی کتێبی: (الإسلام کما یتجلّی فـي کتاب الله)یە، وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی.

شایانی باسیشە بابەتی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەریایەکی قووڵ و فراوانەو، هەق پێدانی زۆر زەحمەتە، بەڵام من لەم بەرهەمەدا هەوڵمداوە، لەبواری لێتێگەیشتن و مامەڵە لەگەڵ کردنی سوننەتی پێغەمبەردا، چەند تێبینی و سەرنج و بەرچاوڕوونییەك بخەمەڕوو، کە پێم وایە گەلێك هەڵە و پەڵەی جۆراوجۆری مسوڵمانان بەهەموو توێژەکانیانەوە، ڕاست دەکەنەوەو، ڕێی تێگەیشتنێکی ڕاستترو قووڵتر، لەبارەی سوننەتەوەو، هەڵس وکەوت کردنێکی سەرڕاستانەتر، بۆ مسوڵمانان دەرەخسێنن و ئاچووغ دەکەن.

شایانی باسیشە لەم ڕۆژگارەدا لەبارەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا (سنة رسول الله) (صلی الله علیه وسلم)، مشت و مڕو ڕاجیایی و ناکۆکییەکی زۆر هەیە لەنێو مسوڵماناندا، کە بەڕای بەندە سەرجەم ئەو بیروڕا جیاوازو ناکۆکانە، لەسێ حاڵەتدا بەرجەستە دەبن:

**حاڵەتی یەکەم:** نکووڵیی لێکردنی سوننەت (إنکار السنة) بە بڕوبیانووی جۆراوجۆرەوە، کە دیارە لایەنگرانی ئەم ڕایە مەگەر چۆن، دەنا لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام و مسوڵمانەتیدان و، کێشەی ئەو جۆرە کەسانەش تەنیا لەگەڵ دەقەکانی سوننەت نیە، بەڵکو هەمان کێشەو گرفتیان "ئەگەر بوێرن بیڵێن" لەگەڵ قورئان و ئایەتە موبارەکانیشیدا هەیە!

**حاڵەتی دووەم:** تێپەڕاندن و زێدەڕۆیی کردن لە: بەسوننەتی پابەندکەر (السنة المُلْزِمة) لە قەڵەمدانی سەرجەم دەقەکانی سوننەت و، بەبەشێك لەئیسلام دانانیاندا، بەبێ سەرنجدانی جۆرو نێوەڕۆکیان و، سەنەدو پلەی ڕاستییان.

**حاڵەتی سێیەم:** بەزایەدان و کورت هێنان بەرانبەر سوننەت و بەبێ هەبوونی بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوەو ناچارکەر، ڕەتکردنەوەی بەشێك لە دەقەکانی سوننەت، بە بیانووی جۆراوجۆرو ئیددیعای بێ بنەما.

هەڵبەتە هەمیشە خەتی نێوەڕاست گرتن (التوسُّط) و هاوسەنگیی (اعتدال) یش مرۆڤ لە هەردووك حاڵەتی تێپەڕاندن (إفراط)و بەزایەدان (تفریط) دەپارێزێ و ئێمەش لەم کتێبەدا هەوڵی ئەوەمان داوە، کە لەبواری مامەڵەکردن لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، ئەو ڕێیە ڕاستە پێشان بدەین.

هیواداریشم ئەم کتێبە ئەو ئامانجە گرنگەی
بۆی نووسراوە، بیهێنێتەدی.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت،
أستغفرك وأتوب إليك

٣ شعبان ١٤٣٦ ك
٢١ مایسی ٢٠١٥ ز

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله والصلاة والسلام والبركات من الله على رسول الله محمد المبعوث رحمة للعالمين، وآله المهتدين بهداه المبين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

**خوێنەری بەڕێز!**

لەم ڕۆژگارەدا مشت و مڕ لەبارەی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) زۆرە و بەردەوامیش لەو بارەوە مشت و مڕ هەبووە و هەر دەشبێ، ئنجا چ بەهەق چ بەناهەق.

بەڕای بەندەش باشترین جۆری و شێوازی بەرگریی کردن لەڕێبازی پێغەمبەری خوا (محمد) بریتیە لەڕاست و دروست ناساندن و خستنەڕووی ئەو ڕێبازە بەرزو بەپێزە، چونکە وەك گوتراوە: (الناس أعداءُ ماجَهِلُوا) خەڵك دژی شتێکن کە پێی ئاشنانەبن.

ئنجا ئامانج و مەبەستی بنەڕەتیی ئامادەکردنی ئەم کتێبەش هەرئەوەیە کە ڕێباز و ڕێ و شوێنی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەکی ڕاست و دروست پێناسە بکرێ و، وەك خۆی بخرێتە ڕوو.

شایانی باسەیشە ئەم کتێبە لەچاپی دووەمی دا، زۆر جیاوازە لەچاپی یەکەمی، چونکە وێڕای گۆڕینی ناو ونیشانەکەی لە: (شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆیی دا) بۆ: (پێناسەو

پێویستیی و گرینگیی ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)).

**حەوت بەشی دیکەشی لێ زیاد کراون[١]، بەشەکانی لە دووانەوە بوونە نۆ بەش، بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**بەشی یەکەم:** ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یانی چی؟

**بەشی دووەم:** چۆن شوێن ڕێبازی (سنة)ی پێغەمبەر بکەوین؟!

**بەشی سێیەم:** بەڵگەکانی سەرچاوە بوونی سوننەت بۆ شەریعەت.

**بەشی چوارەم:** ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت.

**بەشی پێنجەم:** بەبێ شارەزایی لە قورئان، مەحاڵە تەنیا بەهۆی سوننەتەوە بتوانرێ تێگەیشتنێکی ڕاست و هاوسەنگ لەبارەی ئیسلامەوە دەستگیر ببێ.

**بەشی شەشەم:** ڕەواندنەوەی تەمو مژ لەسەر کۆکردنەوەی سوننەت.

**بەشی حەوتەم:** جۆرەکانی سوننەت.

**بەشی هەشتەم:** هۆیەکانی هەڵبەستن (أسباب الوضع) و چۆنیەتی لەیەك جیاکردنەوەی فەرموودەو قسەی هەڵبەستراو.

**بەشی نۆیەم:** ناگونجێ فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هیچ کام لە: (عەقڵ، قورئان، واقع، زانست) دا دژبوەستێ.

شایانی باسیشە، کە لەنێوان هەندێك بەشی زیادکراوی ئەم چاپە و هەردووك بەشی یەکەم و دووەم دا، وێکچوون و جۆرێك لەدووبارە بوونەوە هەیە، بەڵام وەك گوتراوە:(في الإعادة إفادة) ئنجا هەرکام لەبەشەکان شێواز و تایبەتمەندیی خۆیانیان هەیە و مایەی بەرچاو ڕوونیی و تیشك خستنە سەری بابەتەکانن.

---

(١) ئەو حەوت بەشەش لەتەوەری یەکەمی مەوسوعەی (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحی و واقعدا ) وەرگیراون، کە بەرهەمێکی بەندەیە و لەژێر چاپە.

هیواداریشم ئەم کتێبە لەم چاپی دووەمیدا، ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونیی زیاترو چاکتری عەودالانی هەق و، شەیدایانی ڕێباز و ڕێ و شوێن و ئاکار و ڕەوشتی بەرز و مەزنی پێغەمبەری کۆتایی (محمد).(صلى الله عليه وسلم)

سبحان ربك رب العزة عما يصفون

والسلام على المرسلين، والحمد لله رب العالمين

٢٠١٧/٨/٢٠ ز

١٤٣٨/١١/٢٨ك

هەولێر

## دەستپێك

**بەڕێزان!**

هەركامێك لە ئێمە ئەگەر هەر تۆزێك ئاگاداری وەزعی دنیا بێ، دەزانێ كە ئەمڕۆ ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژهەڵاتی دونیاوە بۆ ڕۆژئاوای و، لە باكووریەوە بۆ باشووری، نەك هەر لە قەیرانێك، بەڵكو لە چەند جۆرە قەیرانێكدا دەژی: عەقیدەیی، ئاكاریی، ئابووریی، فیكریی، ئەمنیی، بەڵام ئەگەر خەڵكی دیكە، خەڵكی نا مسوڵمان، سەری لێدەشێوێ و سەرگەردان دەبێ و تووشی قەیران دەبێ و، نازانێ چۆن خۆی لەو گرفت و كێشانە دەرباز بكات! ئێمە هەمیشە ڕێی سەرفرازیی و چارەسەرمان لەبەر دەستدایە، كە ئەویش بریتیە لەو وەحیی و پەیامەی خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا (محمد) (صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی، وەحیی خواش لە قوڕئاندا بەرجەستەیەو، لەو ڕێبازو ڕێ و شوێنەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) كە قوڕئانی بۆ بەرجەستە كردووین، چونكە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە بەرجەستەكردنی قوڕئان لەسەر ئەرزی واقیع.

ئەو بابەتەی من ئامادەم كردوە و هیوادارم بە وردی لەگەڵمدا بن، بابەتێكی زۆر گرنگ و هەستیارە، {چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)}.

**لەسەرەتاوەش دەڵێم:**

وشەی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (سنة رسول الله) مەبەستم پێی كۆی ئەو ڕێبازو ڕێ و شوێنەیە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆی بەجێ هێشتووین، ئنجا من بابەتەكەی خۆم لە حەوت خاڵدا دەخەمە ڕوو، كە ئەمانە ناوونیشانەكانیانن:

١- پێناسەی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

٢- گرنگیی سوننەت بۆ پابەندییەكی ڕاست و دروست بە قورئانەوە.

٣- بەڵگەبوونی سوننەت لەبواری یاساكانی شەریعەتدا.

٤- جۆرەكانی حوكمەكانی سوننەت، بەنسبەت پەیوەندییان بەقورئانەوە.

٥- پۆلێنكردنی سوننەت، لە ڕووی سەنەدەوە.

٦- پۆلێنكردنی سوننەت، لە ڕووی نێوەڕۆكەوە.

٧- بەرهەمی مامەڵەی ڕاست ودروست لەگەڵ سوننەتدا.

هەڵبەتە هەوڵدەدەم زۆر بە چڕیی و پڕیی و گوشراویی قسەكانم بكەم و، زۆرجار شەرح و تەفسیرەكەی عایدی خۆتان دەكەم.

## ا- پێناسەی سوننەتی پێغەمبەر:

هەم شەرعزانان (فقهاء) و هەم زانایانی بنچینەکانی شەرع (أصول الفقه) و هەم فەرمووده‌ناسان (محدِّثون) پێناسەی سوننەتیان کردوە: شەرعزانان وشەی سوننەتیان لە بری (مندوب) و (تطوع) بەکارهێناوە، بەڵام زانایانی (أصول الفقه) و (محدِّثون) وشەی سوننەتیان بۆ ئەو ڕێبازو ڕێ و شوێنەی، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بووە، بەکارهێناوە، دیارە (سنة)یش وشەیەکی عەرەبییەو لە ئەصڵی زماندا بەمانای ڕێبازێکی چەسپاوە:

(السنة: الطريقة والسيرة يقال: سنَّ بهم سنة فلان، وفي السنة معنى وقوع شيء على نحو مطَّرد ثابتٍ)، كما قال تعالى:

﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴾ الاحزاب -٦٢

واتە: وشەی سوننەت لە زمانی عەرەبییدا بە مانای ڕێگاو ڕێباز دێ، دەگوترێ: (سنَّ بهم سنَّة فلان) واتە: بە هەمان ڕێبازی فڵان کەسدا بردنی، یان مامەڵەی لەگەڵدا کردن، هەروەها وشەی سوننەت بە حاڵەتێکی چەسپاو و نەگۆڕ دەگوترێ، کە بەردەوام بێ، وەك خوا فەرموویەتی: (ڕێبازی خوا لەوانەدا کە پێشتر ڕابردوون، گۆڕان بۆ ڕێبازی خوا نابینی).

ئنجا وشەی سوننەت لە (إصطلاح)دا، واتە: لەباوی زانایانی (أصول الفقه) و زانایانی فەرموودە (علماء الحديث)دا و ئەو پێناسەیەی کە لەسەری ڕێککەوتوون ئاوایە: (السنة ما صدر عن رسول الله غير القرآن، من قول أو فعل أو تقرير، ومنه سيرته)[1]، یانی سوننەت بریتییە لەوەی کە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بە ئێمە گەیشتوە، لە فەرمایشت و کردەوە و لە دانپێداهێنان

---

(١) بڕوانە: تيسير علم أصول الفقه، ص١٧-٢٨، عبدالله بن يوسف الجديع.

{دوایی زیاتر بۆتان ڕوون دەکەمەوە، ئەمانە مانایان چۆنە؟}.

هەروەها سیرەو ژیانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەکەوێتەوە نێو بازنەی سوننەتەوە.

**کەواتە: سوننەت سێ بەشە:**

**١- سوننەتی گوتەیی (السنة القولية):**

**ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **فەرمووِنی، کە ئەویش دەبێتە دوو بەش:**

أ- فەرموودەی ڕاشکاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (القول الصريح)،

بۆ وێنە: فەرموویەتی:

**(إنمـــا الأعـــمـــال بالنيـــات).**[1]

واتە: بێگومان کردەوە باشەکان بە پێی نیەتن، یانی: کردەوە باشەکان بە پێی نیەت و نیازی دڵ، لە ئینسان وەردەگیرێن.

ب- لەمانای فەرموودە و گوتن دایە (فيه معنى القول):

جۆرێکی دیکەی سوننەتی قەولیی ئەوەیە کە مانای فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەگەیەنێ، نەك خۆی فەرموودە بێ، ڕاستەوخۆ، بۆ وێنە: هاوەڵان گوتوویانە:

**( أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ بِسَبْعٍ وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ.... ).**[2]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە حەوت شت پێکردووین‌و حەوت شتیشی لێ قەدەغە کردووین.

---

(١) البخاري: ١ ، و مسلم: ١٩٧

(٢) البخاري: ٥٦٣٥، ومسلم: ٢٠٦٦.

هەروەها گوتوویانە: (أُمِرْنَـا بالصـدقـة...).[١]

واتە: فەرمانمان پێکراوە کە خێر بکەین.

هەروەها گوتوویانە: (نُهينـا عـن التكـلُّف...).[٢]

واتە: ڕێگرییمان لێکراوە کە سەختگیریی بکەین.

## ٢- سوننەتی کردەیی ( السنة الفعلية ):

سوننەت تەنیا ئەوە نیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، بەڵکو جۆرێکی دیکەی ڕێوشوێن و ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە کردەوەکانی، ڕەوشت و ئاکارو هەڵسوکەوتی، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك کۆمەڵە گەنجێك میوانی بوون، ئنجا گێڕەرەوە (راوي) کە دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زانی، تامەزرۆیی سەردانی ماڵەوەمان کردوە، چەند ئامۆژگارییەکی کردین، لە کۆتایی ئامۆژگارییەکانی دا پێی فەرمووین:

**(وصـلُّوا كمـا رأيتمونـي أُصلِّي).**[٣]

واتە: (نوێژ بکەن، وەك چۆن منتان بینی، نوێژم کرد)، هەروەها دوای ئەوەی لەبەرچاوی هاوەڵانی حەجی کردوە، فەرموویەتی:

**(لتـأخـذوا عني منـاسككم...).**[٤]

واتە: خوا پەرستییەکانی حەجم لێ فێربن، یانی: تەماشام بکەن و خواپەرستییەکان حەج لەمنەوە فێربن.

---

(١) البخاري: ٤٦٦٩، ومسلم: ٢٣٥٢، عن ابن مسعود.

(٢) البخاري: ٧٢٩٣، عن عمر "رضي الله عنه".

(٣) البخاري: ٦٨١٩، عن مالك بن حويرث.

(٤) مسلم: ١٢٩٧، عن جابر بن عبدالله.

## ٣- سوننەتی دان بۆ پێداهێنان (السنة التقريرية):

سوننەتی تەقریریی کە زانایان ئاوایان پێناسە کردوە: (المقصود بها: سكوت النبي وتركها الإنكار على قولٍ أو فعلٍ وقَعَ بحضرته أو في غيبته و بَلَغهُ، أو تأكيده الرضا بإظهار الإستبشار به أو استحسانه).(١)

واتە: بریتیە لەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شتێك لەبەرچاوی کرابێ، یاخود قسەیەك گوترابێ، ئنجا لەلای وی بووبێ، یاخود لەلای وی نەبووبێ، بەڵام دوایی پێیگەیشتبێتەوەو، ڕەخنەی لێ نەگرتبێ، یاخود داکۆکیی لەسەر کردبێ و خۆشحاڵیی لەسەر دەربڕیبێ (لەسەر ئەو کارەی کراوە، یان ئەوقسەیەی گوتراوە).

بۆ وێنە: با تەماشای ئەو فەرموودەیە بکەین، کە زۆر جێی سەرنجە بەتایبەتی بۆ خوشکانی بەڕێزمان:

**أ- (عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، وَذُكِرَ عِندَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ: الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ رَضِىَ اللَّهُ عَنهَا: قَدْ شَبَّهْتُمُونَا بِالْحَمِيرِ وَالْكِلاَبِ، وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ "صلى الله عليه وسلم" يُصَلِّي وَأَنَا عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ مُضْطَجِعَةٌ، فَتَبْدُو لِي الْحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ فَأُوذِيَ رَسُولَ اللَّهِ "صلى الله عليه وسلم" فَأَنْسَلُّ مِنْ عِندِ رِجْلَيْهِ).(٢)**

مەسرووق یەکێکە لە زانایانی تابیعین لە دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە: لەلای دایکمان عائیشە باسی ئەوە کرا، کە چ شتێك نوێژ دەبڕێ (ئینسان کە نوێژ دەکات، چ شتێك بە پێشیدا بێ، نوێژەکەی دەبڕێ؟ کە هیچ شتێك نوێژ نابڕێت بۆ زانیارییتان)(٣) یەکێك گوتی: سێ شت نوێژ دەبڕن: سەگ و کەرو

---

(١) بڕوانە: تيسير علم اصول الفقه، ص ٢٨.

(٢) رواه البخاري: ٥١٤، و مسلم: ١١٤٣.

(٣) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

ئافرەت، (یانی: ئەگەر سەگ بە پێش ئینساندا بڕوات، یاخود کەر، یان ئافرەت) عائیشەش "خوا لێی ڕازی بێ" ڕەخنەی گرت و گوتی: ئێمەتان بە سەگ و گوێدرێژ چواند!! { ئەوە ڕاست نیەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتی وای نەفەرموە }[1] سوێند بە خوا من پێغەمبەری خوام بینیوە نوێژی دەکرد، (دیارە شەونوێژی کردوە) منیش لەسەر جێگای خۆم بووم لە نێوانی پێغەمبەری خواو ڕووگەدا، جاری وا هەبوو ئیشێکم دەبوو، پێم ناخۆش دەبوو دابنیشم و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەزیەت بدەم، بە لەباریی هەڵدەستام و بەلای لاقانی دا دەردەچووم.

واتە: ڕاست نیە کە ئەو شتانە نوێژ دەبڕن.

چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دایکمان عائیشە لە پێشی بووەو نوێژەکەشی کردوە.

کەواتە: ئافرەت لە پێش ئینسان بێ، نوێژی ئینسان نابڕێ، ئنجا باپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەشیگوتبێ، بەڵام مادام لە پێشی بووەو ڕەخنەشی لێ نەگرتوە، کەواتە: دانی پێدا هێناوە.

**ب- (عن جابر (رضي الله عنه) كنا نَعْزِل على عهد نبيّ الله، فبلغ ذلك النبيّ، فلم يَنهنا عنه)**[2].

واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (عَزْل)مان دەکرد، هەواڵی ئەوەمان بە پێغەمبەر گەیشتەوە، ئەویش ڕێگریی لێ نەکردین.

(نَعْزِل) یانی: دووریی گرتن و کەنارگیریی، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، مێرد لەکاتی جووتبوونی لەگەڵ هاوسەری دا، نەهێڵێ ئاو (مني)ەکەی بچێتە نێو مندالّدانیەوە.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) البخاري: ٢٥٠٨،ومسلم: ٣٥٤٦.

**ج- (عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: كنا نغزو مع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في رمضان فمِنّا الصائم ومِنّا المفطر، فلا يجد الصائم على المفطر، ولا المفطر على الصائم).**[1]

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی دەڵێ: ئێمە لە مانگی ڕەمەزاندا دەچووین بۆ جەنگ، ئنجا هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەشمان بوو بێ ڕۆژوو بوو، نە ئەوەی کە بەڕۆژوو بوو، ڕەخنەی لەوە دەگرت کە بەڕۆژوو نیە و، نە ئەوەش کە بێ ڕۆژوو بوو، ڕەخنەی لەوە دەگرت کە بە ڕۆژووە.

واتە: بە پێچەوانەی وەزعی مسوڵمانانی ئێستاوە، کە لەسەر ئەو شتانەی ڕاجیایی هەڵدەگن، یاخود بە شێوەیەك لە شێوەکان زیاتر جێبەجێ دەکرێن، هەرکامێکیان ڕەخنە لەوی دی دەگرێ، کە ئەوە لەخۆیدا نیشانەی کرچو کاڵیی و فراوان تێ نەگەیشتنە لە ئیسلام، ئەگەرنا جاری وا هەیە ئەو ئەرکە شەرعییە ئاواش جێبەجێ دەکرێ و، ئاواش جێبەجێ دەکرێ، بەو جۆرەش دەبێ و بەوجۆرەش دەبێ، نابێ هیچ کەس ڕەخنە لەوی دیکە بگرێ، مادام لە سنوورو شیرازەی شەرعدایە.

ئەمە ئەوەبووە کە لەچاپی یەکەمدا گوتوومەو ئێستاش: (٢٠١٧/٧/١٧ز بەرانبەر **٢٣/**شەووال **١٤٣٨**ك)و لە چاپی دووەمی ئەم کتێبەدا لەوبارەوە -بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو کۆکردنەوەی مەبەست- دەڵێم:

---

(١) مسلم: ٢٦١٣، و الترمذي: ٧١١٣، و النسائي: ٢٣٠٨.

# پێناسەی سوننەتی
# پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )

**وشەی (سُـــنَّة) بەچوار جۆر پێناسە کراوە لەلایان هەر کام لە:**

**اللغويين:** زمانزانان

**الفقهاء:** شەرعزانان

**الأصوليين:** شارەزایانی بواری بنچینەکانی فیقە (أصول الفقه)

**المحدِّثين:** فەرموودە ناسانەوە:

١- وشەی (سنة) لەلای زمانەوانان، بەمانای (طريقة وسيرة)دێ یان: ڕێبازو ژیاننامە، بڕوانە:

١- مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني ص ٤٢٩.

٢- المصباح المنير، للفيومي، ص١٥٢.

٣- مختار الصحاح، للرازي، ص ٣١٧

٢- لەلای شەرعزانانیش وشەی (سنة) بەمانای خواپەرستیی پەسند و زیاد لەفەرز (النافلة، المندوب، التطوع) دێ.

**بڕوانە:** الإحكام في أصول الأحكام، للآمدي،ج١ ص٢٢٣،

الوجيز في أصول الفقه، للدكتور عبدالكريم زيدان، ص ١٦١.

أصول الفقه في ثوبه الجديد، للدكتور مصطفى الزلمي، ص٦٣.

٣- لەلای زانایانی بنچینەکانی فقە (أصول الفقه)، وشەی (سنة) بەمانای هەرشتێك دێ کە لەپێغەمبەرەوە دەرچووبێ جگە لەقورئان، لەقسە و کردەوەو دان بۆپێداهێنان: (ما صدر عن النبي (صلى الله عليه وسلم) غير القرآن من قول أوفعل أوتقرير)

**بڕوانە:** الوجيز في أصول فقه، ص١٦١.

٤- لەلای فەرموودەناسان، وشەی (سنة) بەمانای کۆی ئەو شتانە دێ لە پێغەمبەری خواوە گێڕراونەوە، لەقسە و کردەوە و دان بۆ پێداهێنان و سیفەتێکی جەستەیی و ژیاننامە، چ پێش پێغەمبەرایەتیی و چ دوای پێغەمبەرایەتیی، (ما أثر عن النبـي (صلى الله عليه وسلم) من قولٍ أوفعلٍ أوتقريرٍ أوصفةٍ خَلْقية أوسيرة، سواء كان ذلك قبل البعثة أو بعدها).

بڕوانە: أصول الفقه في نسيجه الجديد، ص٦٤،٦٣.

بەڵام من پێم وایە ڕاستتر وایە (سنة النبي الخاتم) بەم جۆرە پێناسە بکرێ:

(هي طريقة النبـي الخاتم (صلى الله عليه وسلم) لتطبيق القرآن الكريم وتجسيده على أرض الواقع وكيفيَّته) واتە: سوننەتی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لەو ڕێباز و چۆنیەتییەی کە گرتوویەتە بەر بۆ جێ بەجێکردن و بەرجەستەکردنی قورئانی بەڕێز لەدنیای واقیع دا.

هیچ گومانیشی تێدانیە کەمەبەستمان ئەوە نیە: وەحییەك کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، لەقورئان دا کورت هەڵاتوە، چونکە بەدڵنیاییی پێغەمبەری خوا بۆ چۆنیەتیی جێ بەجێکردنی قورئان، وێڕای بەکارهێنانی عەقڵ و هۆشی خۆی، گەلێك جاران پشتی بەڕێنمایی و ئاڕاستەکردن و فێرکردنی خواش بەستوە، ئەوەش ڕاستییەکی نکوولیی لێ نەکراوەو سەدان ڕووداو بەڵگەینی، بۆ نموونە: ڕێنمایی کردنی جبریل بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیان دا، وەك

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

(نزل جبريل فأمّني فصلّيت معه، ، ثم صلّيت معه، ثم صلّيت معه، ثم صلّيت معه، ثم صلّيت معه، يَحْسِبُ بأصابعه خمس صلوات) رواه البخاري: ٤٠٠٧ ومسلم: ١٣٧٨ وابوداود: ٣٩٤ والنسائي: ٤٩٣ والدارقطني: ٦٦٨، وهذا لفظ مسلم عن أبي مسعود.

واتە: جبريل دابەزی پێش نوێژیی بۆکردم: نوێژم لەگەڵ کرد، دوایی نوێژم لەگەڵ کرد، دوایی نوێژم لەگەڵ کرد، دوایی نوێژم لەگەڵ کرد، دوایی نوێژم لەگەڵ کرد، بە پەنجەکانی پێنج نوێژی ژماردن.

**کەواتە:**

ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) شتێکی: جیاواز نیە لە قورئان، بەڵکو قورئان و سوننەت دووشتی پێکەوە ئاوێتەو تێکهەڵکێشن و، مەبەستیش لەڕوونکردنەوەی پێغەمبەر بۆ قورئان (تبيين النبي للقرآن) کە خوا کردوویەتە ئەرکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك فەرموویەتی:

﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾
النحل: ٤٤

ئەوەیە کە چۆنیەتی پابەندیی بەقورئانەوە و شێوازو ڕێبازی جێ بەجێ کردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع ڕوون بکاتەوە و هەرواشی کردوە، نەك قورئانیان بۆ تەفسیر بکات، کە وای نەکردوە، چونکە قورئان بۆ خەڵکی خۆی ڕوون و ڕوونکەرەوەیە.

## ٢- گرنگیی سوننەت، بۆ پابەندییەکی ڕاسـت و دروسـت بە قورئـانەوە:

بەڵێ، ئێمە بەهۆی سوننەتەوە دەتوانین قورئان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست جێبەجێ بکەین و، هەر ئەوەش مەبەستی فەرمایشتی خوایە:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾

النحل: ٤٤

ئەگەرنا ماناو مەبەستی قورئان بۆ ئەهلی خۆی ڕوونەو، مەتنی ئیسلام بریتیە لە قورئان و، ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی بووە بۆ هاوەڵانی بەڕێزی، بۆ شوێنکەوتووان (تابعین) کەلەدوای ئەوان هاتوون، بۆ هەموو جیل و وەچەکانی ئوممەتی (محمد)،تەنیا قورئان بووە، ئەدی سوننەت شوێنی لە ئیعراِبدا چیە؟

سوننەت بریتیە لە چۆنیەتی پڕاکتیزە کردن و جێبەجێکردنی قورئان، ئنجا بابزانین گرنگیی سوننەت بۆ پاندییەکی ڕاست و دروست بە قورئانەوە، چۆنە؟

دیارە ئێمە بە هۆی سوننەتەوە دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بەقورئانەوە، پابەند بین، نەك بەهۆی سوننەتەوە لە قورئان تێبگەین،چونکە ئەگەر تێگەیشتنی قورئان پەکی لەسەر غەیری خۆی کەوتبایە، بۆ وێنە: پەکی لەسەر ئەوە کەوتبایە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شەرح و تەفسیری بکات، ئێستا ئێمە تەفسیری پێغەمبەرمان دەبوو بۆ قورئان، بەڵام ئایا تەفسیرێکمان هەیە بڵێین ئەوە تەفسیری پێغەمبەری خوایە بۆ قورئان؟ نەخێر، بۆچی؟ چونکە خوا لە قورئانی بەپێزدا دەفەرموێ:

﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴾ الحجر -١-

واتە: ئەمانە چەند ئایەتێکی کتێب و قورئانی ڕوونن. وشەی (مبین) دەگونجێ (لازم) بێ و دەگونجێ (متعدِي) بێ، واتە: هەم بەمانای ڕوون

بێت، هەم بەمانای ڕوونکەرەوە. چونکە قورئان ڕوونیشەو ڕوونکەرەوەشە، واتە: پێویستی بەوە نیە ڕوون بکرێتەوە بەگشتیی، نەك هەمووی، ئەدی سوننەت دەوری چی دەبینێ؟ دوایی باسی دەکەم.

هەروەها خوا لە چوار ئایەتی قورئاندا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾ القمر -١٧و٢٢و٣٢و٤٠-

واتە ئێمە قورئانمان ئاسان کردوە بۆ لێ تێگەیشتن، ئایا کەس نیە بێ لێی تێبگات!

یانی: ئاسانە لێی تێبگەن، بۆچی نایەن لێی تێبگەن؟ لەچوار جێگایان دووبارە بۆتەوە لەو سوورەتەدا.

ئنجا دوای ئەوەی خوا دەفەرموێ: قورئانمان ئاسان کردوە بۆلێ تێگەیشتن، کەس بۆی نیە بڵێ: قورئان پێویستی بەغەیری خۆی هەیە، بۆئەوەی لێی تێبگەین.

هەروەها قسەکەی دایکمان عائیشە "رضي الله عنها" کە گوتوویەتی:

**(فإنَّ خُلُق نبيّ الله كان القرآن).**[1]

ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە (سعد بن هشام بن عامر) کە یەکێکە لە تابیعین، پرسیاری لە عائیشە کردو، ئەم وتووێژەیان بوو:

**(يا أم المؤمنين! أنبئيني عن خُلُق رسول الله، قالت: ألست تقرأ القرآن؟ قلت: بلى، قالت: فإن خُلُق نبي الله كان القرآن).**

واتە: ئەی دایکی ئیمانداران! هەواڵم پێ بدە لەبارەی خوو ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە چۆن بوو، گوتی: ئایا قورئان ناخوێنیەوە، شارەزای قورئان نی؟ گوتم:

---

(١) مسلم: ١٧٣٦، و أبوداود: ١٣٤٣.

با، گوتی: هەڵسوکەوت و ئاکاری پێغەمبەری خوا، قوڕئان بوو.

دیارە سوننەت بەرجەستەکەری قوڕئانە لەسەر ئەرزی واقیع، لە هەموو بوارەکانی دینداریی و دنیادارییدا: (عیبادەت، ئەخلاق، جەنگ و جیهاد، حوکم و سیاسەت...) بەڵام ئێمەی مسوڵمان گرفتمان ئەوەیە کە زۆرجار ئەم فەرمایشتانە، یان هەندێك وشە لەنێویاندا مانایەکی باو (عرفی)ی هەڵەیان بۆ دروست بووە، بۆ وێنە: وشەی (خُلُق) ئێمە زۆربەمان هەروای لێ تێدەگەین، کە بە واتای ئەوە دێ: مرۆڤ درۆ نەکات، غەیبەت نەکات، نەزەر نەکات و، حەڕام نەخوات! بەڵام وشەی (خُلُق) لە ئەصلی زمانی عەرەبییدا و لەبەکارهێنانی قوڕئان و سوننەتدا واتە: کۆی هەڵسوکەوتەکانی ئینسان، کاتێك خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم -٤-

واتە: {ئەی موحەممەد!} تۆ هەموو هەڵسوکەوت و ئاکارەکانت بەرزو پەسندو مەزنن، کەواتە: لێرەدا کە دایکمان عائیشە دەڵێ: ڕەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قوڕئان بوو، واتە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قوڕئانی لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و. هتدی دا بەرجەستە کردبوو.

ئنجا کە خوای کاربەجێ لە قوڕئاندا دەفەرموێ:

﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل -٤٤-

واتە: قوڕئانمان بۆ تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی کە بۆ خەڵك دابەزێندراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە.

**ئەدی ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە؟**

لەوەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەری خوا چۆنیەتی کارپێکردنی قورئانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەگەرنا ئەگەر ئەرکی پێغەمبەر بووایە (صلى الله عليه وسلم) هەموو قورئان ڕوون بکاتەوە، ئێمە ئێستا تەفسیرێکمان دەبوو، بە ناوی تەفسیری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ قورئان، کە بەدڵنیاییەوە تەفسیرێکی وامان نیە، بەڵکو تەنیا چەند وشە و ڕستەیەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوەی کە هاوەڵان ئیشکالیان لەسەریان پەیدابووە، بۆی ڕوون کردوونەوە، بۆ وێنە: ئەو ئایەتەی (الأنعام) کە خوا عز وجل تێیدا فەرموویەتی:

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ -٨٢-

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ستەم و خراپەیان تێکەڵ بە بڕوایەکەیان نەکردوە، ئا ئەوانە دڵنیایی (سزانەدران) یان بۆ هەیەو، هەر ئەوانەش ڕێی ڕاست گرتووانن.

چونکە کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوار، هاوەڵان سەغڵەت بوون و ترسان، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە:

{عن ابن مسعود قال: لما نزلت هذه الآية شقَّ ذلك على المسلمين، فقالوا: يا رسول الله ! وأيُّنا ذلك؟ فقال: إنما هو الشرك ألم تسمعوا ما قال لقمان لابنه: (إنّ الشركَ لظلمٌ عظيم) لقمان -١٣- ، ؟!}. رواه أحمد في المسند (٥/ ٢٠٧) والبخاري ومسلم والترمذي.

واتە: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوار، لەسەر مسوڵمانان قورس بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! کێمان وایە؟ - واتە: کێمان ستەم و خراپەی نەکردوە و تێکەڵی ئیمانەکەی نەکردوە؟- ئەویش فەرمووی: لێرەدا مەبەست لە (ظلم) شیرکە، ئەدی گوێتان لێ نەبووە کە لوقمان بە کوڕەکەی گوتوە: بێگومان هاوبەش بۆخوادانان ستەمێکی مەزنە؟!

کەواتە: لێرەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو هەڵە تێگەیشتنەی مسوڵمانانی بۆ ئەو ئایەتە ڕاست کردۆتەوەو، بۆی ڕوون کردوونەوە کە مەبەست لە (ظلم) گوناهو خراپە نیە، تاکو هیچکەس دەربازی نەبێ، چونکە هیچکەس نیە هەڵە و گوناهی لێ ڕوو نەدات.

مەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وشەیەکی وای ڕوون کردبێتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەفسیرێکی نەزەریی و فیکریی نەبووە بۆ قورئان، بەڵام ئایا قورئانی بەچی ڕوون کردۆتەوە؟ وەك دایکمان عائیشە گوتوویەتی: بەکردەوەکانی و بە ئاکارو هەڵسوکەوتی، قورئانی بەرجەستە کردوە.

کەواتە: سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە بەرجەستەکردنی قورئان لەدنیای واقیعدا، ئەو قورئانە کە خوا ناردوویەتی، پێویست بەوەبووە کەسێك بەرجەستەی بکات لەسەر ئەرزی واقیع، ئنجا پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) و، پاشان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئنجا ئەوانەی کە شوێن پێغەمبەرو هاوەڵان کەوتوون (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوانە قورئانیان لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆیاندا، بەرجەستە کردوەو، هەر ئەوەش مەبەستە لە: ڕوونکردنەوەی قورئان.

## ٣- بەڵگەبوونی سوننەت (حجية السنة) لە بـواری یاسـاکانی شـەریعەتدا:

ئەوە کە سوننەتی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بەڵگەیەکی سەربەخۆیە لەبواری یاساکانی شەریعەت دا، ڕای سەرجەم زانایانەو، گەلێك بەڵگەشیان لەوبارەوە هەن.

دیارە هەندێ کەس لەدێر زەمانەوە ویستوویانە دڕدۆنگیی بخەنە دڵی مسوڵمانانەوە، سەبارەت بەوە کە ئایا سوننەتی پێغەمبەری خوا بەڵگەیەو، وەك قورئان حوکمە شەرعییەکانی لێوەردەگیرێن، یان نا؟

زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە سوننەتیش وەك قورئان بەڵگەی شەرعییە، بەڵام بەپلەیەکی خوارتر لە قورئان، وەك دوایی باسی دەکەین و، زۆر بەڵگەیان لەسەر ئەوە هێناونەوە، بۆنموونە، ئەم پێنج بەڵگەیە:

**١- یەکسان بوونی قورئان و سوننەت لە وەحی بوون دا** (إستواء السنة مع القرآن في كونها وحياة):

دیارە دەگونجێ زۆر بەڵگانیش لەوبارەوە بێنینەوە، بۆنموونە: پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

**(ألا إني أُوتيت الكتاب ومثلهُ مَعَهُ...).**[1]

واتە: ئاگادار بن! من کتێبم پێدراوەو، وێنەی ئەویشم لەگەڵ ئەودا پێدراوە.

بەڵام لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین و لێی بێ ئاگا نەبین،کە تەنیا بەشێك لەسوننەت وەحییە، نەك هەمووی، بەڵکو زۆربەی سوننەت لە کۆشش

---

(١) رواه أحمد: ١٧١٩٤، و أبوداود: ٤٦٠٤، و الترمذي، ٢٦٦٤، و إسناده صحيح.

(إجتهاد)ەوە بووە. دیارە هەندێکیان بۆ ئیسپاتی ئەوە کە سوننەت هەمووی لە وەحییەوە هاتوە، ئەم دوو ئایەتەیان بەبەڵگە هێناونەوە، کە خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم -٣،٤-

واتە: ئەو (پێغەمبەر) لە ئارەزووەوە قسە ناکات، بەڵام ئەوەی دەیڵێ تەنیا سروشە دەکرێت.

بەڵام من پێم وایە کە لێرەدا (وحی) مەبەست پێی قورئانە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی کە فەرموویەتی، هەمووی هەر وەحی نەبووە، بەڵکو هەندێکی ڕای خۆی بووەو کۆشش (إجتهاد) بووە، بۆیەش جاری وا هەبووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەیپێکاوەو، خوا "سبحانه وتعالى" بۆی ڕاست کردۆتەوە، کەواتە: ئەم ئایەتانە بەڵگەی ئەوە نین کە سوننەت هەمووی (وحی) یە، بەڵکو مەبەست پێیان بەرپەرچدانەوەی کافرەکانە، کە دەیانگوت: (محمد) قورئان لە خۆوە دەڵێ، بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ( وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ) کە مەبەست پێی قورئانە بەتایبەت.

**٢- خوا "سبحانه وتعالى" فەرمانبەریی بۆکرانی خۆی و پێغەمبەرەکەی، هەروەها گێڕانەوەی چارەسەری کێشەو ناکۆکیی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی، بەیەکسانیی باسکردوون** (تسوية الله تعالى بين طاعته و طاعة نبيه، و أمره بإعادة الخلاف إليه وإلى نبيه للفصل فيه):

وەك خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ:

﴿ مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ ... ﴾ النساء -٨٠-

واتە: هەرکەسێك فەرمانبەریی پێغەمبەر بکات، فەرمانبەریی خوای کردوە.

وە لە هەمان سوورەتدا خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ:

﴿ ...فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ... ﴾ النساء -٥٩-

واتە: ئنجا ئەگەر لەشتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە، بیگێڕنەوە بۆلای خواو بۆلای پێغەمبەر، (واتە: بۆلای قورئان و سوننەت) ئەگەر بڕواتان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەیە.

**٣- خوا "سبحانه وتعالى" ڕوونكردنەوەو چۆنیەتی كارپێكردنی قورئانی بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سپاردوە** (تمكين الله نبيه من شرح الكتاب وتفصيل أحكامه وشرائعه):

وەك خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ:

﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل -٤٤-

ئنجامادام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەركی ئەوەبێ كە چۆنیەتی كارپێكردنی قورئان ڕوون بكاتەوە، كەواتە: قورئان هەندێك شتی بەكورتی باسكردوون و، سوننەت ڕوونیان دەكاتەوە، ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یان بەفەرمایشت یان بەكردەوە، بۆمان ڕووندەكاتەوە، بۆنموونە: نوێژ، خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ: (أقيموا الصلاة)، واتە: نوێژ بەرپابكەن، نوێژ چۆن بەرپابكەین؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

**(صلّوا كما رأيتموني أُصلّي) رواه البخاري.**

واتە: نوێژبكەن بەوشێوەیەی منتان بینی نوێژ دەكەم.

هەروەها خوا فەرموویەتی:

﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ... ﴾ البقرة -١٩٦-.

واتە: حەج وعومرە بۆ خوا بەتەواویی بكەن. بەڵام ئایا چۆن حەجێ بكەین؟ پێغەمبەری خوا لە حەجیماڵئاوایی دا فەرموویەتی: حەج چۆن بكەین؟ (لتأخڑوا عني مناسككم) واتە: خواپەرستییەكانی حەج لە من وەربگرن.

**٤- فەرمانی ڕوون و ڕاشکاوی خوا لە کتێبی خۆیدا، بەوە کە دەبێ هەرچی پێغەمبەر هێناویەتی، لێی وەربگیرێ بەبێ جیاوازیی لەنێوان قورئان و غەیری قورئان داو، ترساندنی توندی لە سەرپێچیی لێکردنی** (أمر الله الصريح الواضح في كتابه بقبول ما جاء به الرسول من غير تفريق بين القرآن و غيره و تحذيره أشد التحذير من مخالفة ذلك).

وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ ..وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ الحشر -٧-

واتە: هەرشتێك کە پێغەمبەر پێتان دەدات، لێی وەربگرن، هەرشتێکی لێ قەدەغە کردن، خۆتانی لێ دوور بگرن، پارێز لە (سزای)خوا بکەن، بێگومان خوا تۆڵەی توندە.

هەروەها خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴾ الأحزاب -٣٦-

واتە: هیچ پیاو و ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نیە، کاتێك خوا یان پێغەمبەری خوا، بڕیارێك دەدەن،مافی سەرپشك بوون بە خۆیان بدەن(ئایا بە قسەیان بکەن یان نا؟) هەر کەسێکیش سەرپێچیی لەفەرمانی خواو پێغەمبەر بکات، ئەو کەسە لە سەر لێشێواوییەکی ئاشکرادایە.

**٥- بەڵگە هێنانەوەی مسوڵمانان بەگشتی بەسوننەتی پێغەمبەری خوا، لەبواری چەسپاندنی حوکمەکانی شەریعەتدا** (مضي سبيل المؤمنين على الإحتجاج بالسنن المروية عن رسول الله في إثبات شرائع الدين):

دیارە ئەو یەکدەنگ بوونەی مسوڵمانان بەگشتی و زانا و پێشەوایانیان

بەتایبەت، لەسەر بەڵگەهێنانەوە بە دەقەکانی سوننەت، بۆ چەسپاندنی حوکمەکانی شەریعەت، بەڵگەیەکی نکوڵیی لێنەکراو و حاشا هەڵنەگرە، لەسەر ڕاستیی بەڵگە بوونی سوننەت (حُجِّيّة السنة) لەبواری چەسپاندنی حوکمە شەرعییەکاندا، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ النساء -١١٥-

واتە: هەر کەسێك سەرپێچیی پێغەمبەر بکات، دوای ئەوەی ڕێی ڕاستی بۆ دەرکەوتوەو، بەدوای ڕێیەکی دیکەی جیا لە هی بڕواداران بکەوێ، حەواڵەی کردەوەی خۆی دەکەین و، دەیخەینە دۆزەخەوەو، خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(لا تجتمع أُمتي على ضلالة).[1]

واتە: ئۆممەتی من لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە.



---

(١) ئەم فەرموودەیە بەچەند تەعبیرێك هاتوە: ١/ {إن الله لايَجْمَعُ أُمتي -أو قال أمة محمد- على ضلالة، يَد الله مع الجماعة، ومَنْ شَذَّ شَذَّ إلى النار} الترمذي:٢١٦٧، وأبونعيم في (الحلية) واللاّلكائي في (السنة). ٢/ {لاتجتمع أمتي على ضلالة} أحمد:(٣٩٦/٦). ٣/ {إن أمتي لاتجتمع على ضلالة} ابن ماجه: ٣٩٥٠، وصحَّح الألباني هذا الحديث في السلسلة الصحيحة) : ١٣٣١.

## ٤- جۆرەکانی حوکمەکانی سوننەت، بەنسبەت پەیوەندییانەوە لەگەڵ قورئاندا:

حوکمەکانی سوننەت بەنسبەت پەیوەندییانەوە لەگەڵ قورئاندا، سێ جۆرن:

### یەك: جەختکەرەوەی حوکمەکانی قورئان:

وەك قەدەغەبوونی شیرك و، جادوو و، قەتڵ و، خواردنی سوود و، خواردنی ماڵی هەتیو و، پشتکردنە دوژمن لەکاتی هێرشداو، بوختانی داوێن پیسیی کردن بۆ ئافرەتانی بڕواداری پاك، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەوانەی جەخت لەسەر کردۆتەوە، بۆ وێنە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي قال: اجتنبوا السبع الموبقات، قالوا: يارسول الله و ما هن؟ قال: الشرك بالله، و السحر، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، و أكل الربا، و أكل مال اليتيم، و التولِّي يوم الزحف، وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات)[1].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: خۆتان لە حەوت گوناهە فەوتێنەرەکان بپارێزن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کامانەن؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان و، جادوو و، کوشتنی نەفسێك کە خوا قەدەغەی کردوە، مەگەر بەحەقی خۆی و، سوود خۆریی و، خواردنی ماڵی هەتیو بەستەم و، پشت لە دوژمن کردن لەکاتێك دا هێرش دێنێ و، بوختانی داوێنپیسی بۆ ئافرەتانی پاکی بڕواداری بێ ئاگا.

### دوو: ڕوونکردنەوەی ئەوە کە قورئان بەکورتیی باسی کردوە:

جۆری دووەمی سوننەت، ڕوونکەرەوەی ئەوشتانەیە کەلە قورئاندا بەکورتیی باسکراون، چونکە هەندێك لەوانەی دەڵێن: قورئان کافییەو، پێویستیمان بەسوننەت نیە، لەڕابردووش دا بوون، پێیان گوتراوە: ئەلقورئانیون (القرآنيون)،

---

(١) البخاري: ٢٧٦٦، و مسلم: ٨٩.

واتە: ئەوانەی ئیکتیفا بەقورئان دەکەن و، خۆیان لەسوننەت بێ نیاز دەکەن و، گوتوویانە: هیچ شتێك نیە لە قورئاندا باس نەکرابێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا فەرموویەتی:

﴿ .. مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ... ﴾ الأنعام -٣٨-

واتە: لە کتێبدا هیچ شتێکمان زایە نەکردوە (هەموو شتێکمان باس کردوە).

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ .. وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ... ﴾ النمل -٨٩-

واتە: کتێبمان دابەزاندۆتە سەرت، کە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك.

وەڵامی بەڵگەهێنانەوەش بەم ئایەتانە ئەوەیە: خوا هیچ شتێکی زایە نەکردوە کە باسی نەکردبێ، لەوەی کە پێویستە خوا باسی بکا و، ژیانی ئێمە پێویستی پێیەتی و، خوای پەروەردگار لەقورئاندا هەموو شتێکی ڕونکردۆتەوە، لەوەی کە پێویستە خوا ڕوونی بکاتەوە، بەڵام ئەوەی خوا بەپێویستی نەزانیبێ، خۆی ڕوونی بکاتەوە، ڕوونکردنەوەکەی عایدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)کردوە، بۆ وێنە: خوا فەرمویەتی: (أقيموا الصلاة) نوێژبکەن، بەڵام ئایا چۆن نوێژ بکەین؟ چۆن بزانین کە دەبێ پێنج نوێژبن، نوێژی بەیانی دوو ڕکات و، شێوان سێ ڕکات و، خەوتنان و نیوەڕۆو عەسر، یەکی چوار ڕکات چوار ڕکات؟ هەروەها خوا فەرموویەتی: (وآتوا الزكاة) زەکاتێ بدەن! بەڵام ئایا چۆن دەزانین، زەکات لە چیی و چی دەدرێ و، چەند بدرێ و چۆن بدرێ؟ ئایا لە چەندی چەندو، بدرێ بەکێ و، چۆن وەربگیرێ؟ ئەوە هەمووی سوننەت ڕوونی کردۆتەوە، کەواتە: بەشی دووەمی سوننەت، ڕوونکەرەوەی ئەوشتانەیە کە لە قورئاندا بەکورتیی هاتوون و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان بە قسە، یان بەکردەوە، ڕوونی کردوونەوە.

سێ: حوکمی سەرەتاو سەربەخۆ:

وەك قەدەغەبوونی خواردنی کەڵبەدار لە دڕندان و، چڕنووکدار لە پەڕەوران و، پێکەوە کۆکردنەوەی ئافرەت و پوور، یان پلك (عمة أو خالة)ی.

بەڵێ ژمارەیەك حوکم کەلە سوننەتدا هاتوون،حوکمی سەربەخۆن و، لەقورئاندا نەهاتوون، بۆ وێنە: قەدەغەبوونی هەر دڕندەیەکی کەڵبەدار، کە بەعەرەبیی (سَبُع)ی پێ دەگوترێ کۆیەکەی (سِباع)ە، وە هەر پەڕەور (طير)ێکی چڕنووکدار (ذو مُخْلَب)، هەروەها بەیەکەوە کۆکردنەوەی ئافرەت و پووری، یان پلکی (عمة أو خالة)، خوشکی بابی یان خوشکی دایکی، واتە: ئەگەر ئافرەتێکت هێنا دروست نیە، خوشکی باب، یان خوشکی دایکی، وەك هاوسەر پێکەوە کۆبکەیەوە، ئەگەر ئافرەتەکە مرد، بۆت هەیە خوشکی بابی (عمّة)ی، یان خوشکی دایکی (خالة)ی بێنی، بەڵام بەیەکەوە کۆیان بکەیەوە، حەڕامە، کە ئەوانە هیچیان لە قورئاندا نەهاتوون، بەڵام لەسوننەتی پێغەمبەردا هاتوون، بۆنموونە:

(عن ابن عباس أن رسول (صلى الله عليه وسلم) نهى عن كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَكُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ). [١]

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خواردنی هەر خاوەن کەڵبەیەك لە دڕندان، وەهەر خاوەن چڕنووکێك لە پەرەورانی قەدەغەکردوە، کەئەوەش حیکمەتی خۆی تێدایەودڕندەو پەڕەورە گۆشت خۆرەکان،جەستەیان پڕە لە میکرۆب و نەخۆشیی بڵاودەکەنەوەو، زیان بە جەستەی مرۆڤ دەگەیەنن، خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێ:

﴿.. وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ...﴾ الأعراف -١٥٧-.

واتە: (پێغەمبەر) شتەخۆش و بەتام و بەسوودەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و،شتە پیس و زیان بەخشەکانیان لێ قەدەغە دەکات، واتە: هەرچی کەخوا قەدەغەی

---

(١) البخاري: ٥٧٨٠، و مسلم: ٩٧٢.

کردوە، دیارە زیان بەخشە، بۆیە قەدەغەکردوە،وەئەوەی کە حەڵاڵی کردووە، دیارە سوودبەخشە، بۆیە حەڵاڵی کردوە.

هەروەها لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ئەم دەقەش هەیە:

(عن أبي هريرة نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يُجْمَع بين الْمَرْأَةُ وعَمَّتِهَا وبين المرأة وَخَالَتِهَا) .[١]

واتە: ئەبوهورەیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەهی کردوە لەوە کە ئافرەت و خوشکی بابی، یان ئافرەت و خوشکی دایکی، (کە ئێمە بەکوردیی دەڵێین: پوور یان پلك) بەیەکەوە کۆبکرێنەوە.



---

(١) مسلم: ٣٤٣٠، و النسائي: ٣٢٩٣١.

## ٥- پۆلێن کردنی سوننەت لەڕووی سەنەدەوە (تصنيف السنة من حيث السند):

یەکێك لەجیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان قورئان و سوننەت، ئەوەیە کە قورئان هەمووی بەشێوەی (تواتر) بە ئێمە گەیشتوە، بە هەردووك ڕێگای: نووسین و زارەکیی (كتابه وشفاهاً)، بەڵام سوننەت وانیە.

**أ- جۆرەکانی سوننەت لەڕووی چۆنیەتی گەیشتنیەوە بەئێمە:**

**یەك:** (متواتر): (هو مارواه جمع تحيل العادة تواطؤهم على الكذب، عن مثل عددهم، من أول السند الى منتهاه)[1]، واتە: تەواتور ئەوەیە کە کۆمەڵە خەڵکێك ئەوشتەیان گێڕابێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) (دیتبیان یان لێیان بیستبێ)، کۆمەڵە خەڵکێك کەبەعادەت نەگونجێ ئەو هەموو خەڵکە لەسەر درۆ کۆببنەوەو، مەحاڵ بێ، وە کۆمەڵە خەڵکێك لەوانیان بیستبێ و، کۆمەڵە خەڵکێکیش لەوان، تاکو ئەوکاتەی کە سوننەت تۆمار (تدوين) کراوە، ئەوە تەواتورە، وە ئەوە یەقین دەداتە مرۆڤ، کە ئەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی فەرمووە، یان ئەوەی کردوە، یان دانی پێدا هێناوە.

هەموو سەرچاوەکانی (أصول الفقه) ئەوەیان هێناوە، کە قورئان چەند جیاوازییەکی لەگەڵ سوننەتدا هەن: یەکێك لەوانە ئەوەیە کە خودی خوێندنەوە (قراءە)ی قورئان خواپەرستییە، واتە: قورئان بخوێنیەوە عیبادەتە، هەر پیتێك بخوێنی، دە (١٠) چاکەت بۆ دەنووسرێن، بەڵام سوننەت وانیە، وە یەکێ لە جیاوازییەکانی دیکە ئەوەیە کە قورئان بە تەواتور بەئێمە گەیشتوە، بەڵام سوننەت تەنیا کەمێکی بەتەواتور گەیشتوە.

---

(١) عجالة المتفقه الى معرفة أصول الفقه، هشام البدراني: ص١٣٨.

**دوو:** (آحاد): جۆری دووەمی سوننەت لەڕووی پەیوەندیی لەگەڵ ئێمەدا و گەیشتنی بەئێمە، بریتیە لە ئاحاد(ێحاد)، کە کۆی (أَحَدَ) یان (واحدَ)ە، واتە: تاکەکان، کە ئاوا پێناسە کراوە: (الآحاد مالم يجمع شروط التواتر، ما يرويه الواحد، أو مايرويه العدد القليل،الذين لم يبلغ خبرهم حد اليقين بروايتهم)[1].

واتە: ئاحاد ئەوەیە یەکێك بیگێڕێتەوە، یاخود ژمارەیەکی کەم، کە ژمارەکەیان مرۆڤ نەگەیەنێتە دڵنیایی، تەنیا گومانێکی زاڵ(الظن الراجح) بە مرۆڤ ببەخشێ، ئەوە پێی دەگوترێ: فەرموودەی ئاحاد، کە بەزۆریی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەی ئاحاد بە ئێمە گەیشتوە، ئەوە لەڕووی گەیشتنییەوە بە ئێمە.

**ب- جۆرەکانی سوننەت لەڕووی کارپێکردنیەوە:**

سوننەت لەڕووی کارپێکردنیەوە، دەبێتە سێ بەش: صەحیح و حەسەن و زەعیف (ڕاست و باش و بێ هێز):

١- (الصـحيح): ئەوەیە کە کەسێك لێی دڵنیان کەبەهەڵەدا ناچێ، درۆناکات، دادگەرە، مسوڵمانێکی تێرو تەواوە، شتێکی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیستوە، هی دوای خۆیشی لەوی بیستوە، هی دوای خۆیشی لەو، هەتا ئەوکاتەی کە سوننەت تەدوین کراوە، ئەوە پێی دەگوترێ حەدیسی صەحیح، واتە: ئەو کەسانەی کەحەدیسەکەیان هێناوە، ئێمە لێیان دڵنیاین، کە هیچیان مرۆڤی درۆ نین، وە بەهەڵەشدا نەچوون، وەشتیشیان لەبیر نەچووە، چونکە گرفت هەرئەوە نەبووە ڕاویەکە درۆ بکا، جاری وابووە گێڕەرەوە (راوی)ەکە زانای زۆر باش و خواناس بووە، بەڵام شتی لەبیر چووە.

٢- (الحسـن): ئەوەیە کە لە خوار (صحیح)ەوەیە، بەڵام هەر کاری پێ دەکرێ.
٣- (الضعيف): ئەوەیە کە هیچ کام لە مەرجەکانی (صحیح) و (حسن)ی تێدا نەبن.

---

(١) اصول الفقه، للجديع: ص١٤٠.

(ابن الصلاح الشهرزوري) لە کتێبی: (معرفة أنواع الحديث)دا ئاوا پێناسەی هەریەکە لە: حەدیسی صەحیح و حەسەن و زەعیف دەکات و دەڵێ: (أَمَّا اَلْحَدِيثُ اَلصَّحِيحُ فَهُوَ اَلْحَدِيثُ اَلْمُسْنَدُ اَلَّذِي يَتَّصِلُ إِسْنَادُهُ بِنَقْلِ اَلْعَدْلِ اَلضَّابِطِ، عَنْ اَلْعَدْلِ اَلضَّابِطِ إِلَى مُنْتَهَاهُ، وَلَا يَكُونَ شَاذًّا وَلَا مُعَلَّلاً.

الحسن:الحسنُ يتقاصرُ عن الصحيحِ، والضعيف: كل حديث لم يجتمع فيه صفات الحديث الصحيح، ولا صفات الحديث الحسن، فهو ضعيف)[1].

واتە: فەرموودەی ڕاست (صحیح) ئەو فەرموودەیەکە پاڵدراوەتە لای پێغەمبەر، وە بەزنجیرە گێڕەرەوە (راوي)یەکی دادگەر و ڕاست و پارێزەری بەیەکەوە پەیوەست تاکۆتایی، گێڕراوەتەوە، وە (شاذ) و (مُعَلَّل) نیە.

فەرموودەی باش (حسن)یش ئەوەیە کە لەخوار ڕاست (صحیح)ەوەیە.

فەرموودەی بێهێز (ضعیف)یش ئەوەیە، کە سیفەتەکانی فەرموودەی ڕاست (صحیح) و فەرموودەی باش (حسن)ی تێدا کۆنەبوونەوە.

شایانی باسیشە جۆری بێ هێز (ضعیف) زانایان لە چەسپاندنی حوکمی شەرعییدا بەکاری ناهێنن و، بەس جۆرەکانی ڕاست و باش (صحیح و حسن) بەکاردێنن، بەڵام دیارە جۆری (موضوع) هەڵبەستراو هیچ نیە و، هیچ پەیوەندییەکی بە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) نیە.



---

(١) ص ٧٩، ٩٩، ١١٢.

## ٦- پۆلێن کردنی سوننەت لەڕووی نێوەڕۆکەوە:

**بەڕێـــزان!**

ئەم خاڵە زۆر گرنگە و، لێبێئاگابوونی سەر دەکێشێ بۆ زۆر هەڵەو پەڵەی سەیرو سەمەرە و، ئەوەی ئێستا ئێمە دەیبینین لە جیهانی ئیسلامییدا دەگوزەرێ، بەتایبەت لە هەڵەو پەڵەو لادان و تاوانی، ئەو گرووپە پەرگیرانەی کە دەیانبینن، هەمووی بەهۆی ئەوەوەیە کە لە نێوەڕۆکی سوننەت حاڵی نین، ئنجا با بزانین سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەڕووی نێوەڕۆکەوە، زانایان چۆنیان پۆلێنکردوە؟ کەبەلای کەمەوە، وەك من دوایی باسی دەکەم، سوننەت دەبێتە شەش بەش و، هەر بەشەی بە شێوەی خۆی دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بەڵام سەرەتا بە پێویستم زانی، ئاماژەیەك بەو زانایانە بکەم کەباسی پۆلێنکردنی سوننەتیان کردوە، بە پێی نێوەڕۆکی:

١- یەکەمین زانا لەو بوارەدا بەپێی ئەوەی کە زانایان بەدواداچوونیان بۆ کردوە، (ابن قتيبة)یە لە کتێبێکیدا بەناوی (تأويل مختلف الحديث)[1]، کە (ابن قتيبة) لەساڵی (٢٧٦)دا وەفاتی کردوەو، (ابن قتيبة) یەکەمین کەس بووە، کەباسی پۆلێنکردنی سوننەتی کردوە، کە دوایی ئاماژە بە قسەیەکی دەکەم.

٢- دوای ئەو (القرافي) کتێبێکی هەیە بەناوی (الفروق أو أنوار البروق في أنواع الفروق)[2]، کتێبێکی دیکەشی هەیە بەناوی: (الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام، وتصرفات القاضي و الإمام)[3].

---

(١) ص ١٩٦-١٩٨.

(٢) ج١، ص٣٥٧.

(٣) ص ٩٩ - ١٠٥.

٣- یەکێکی دیکە لەو زانایانە (أبو عبدالله بن محمد بن ابراهیم البقوري)یە، کە کتێبێکی هەیە بەناوی: (ترتیب فروق القرافي)[١].

٤- یەکێکی دیکە لەو زانایانە (ابن قیم الجوزیة)یە، لە کتێبێکیدا بەناوی: (زاد المعاد في هَدْی خیر العباد)[٢].

٥- یەکێکی دیکە لەو زانایانە (شاه ولي الله الدهلوي)یە، لە کتێبی: (حجه الله البالغة)[٣].

٦- یەکێکی دیکە لەوانە:(محمد الطاهر بن عاشور)ە، لەکتێبی (مقاصد الشریعة الإسلامیة)[٤].

٧- یەکی دیکە: (محمد رشید رضا)، لە: (تفسیر المنار)دا[٥].

٨- یەکی دیکە: (محمود شلتوت) لە کتێبی: (الإسلام عقیدةً وشریعة)دا[٦].

٩- یەکی دیکە (د. یوسف القرضاوي)یە لە کتێبی: (السنة مصدراً للمعرفة والحضارة)[٧].

هەڵبەتە زانایانی دیکەش هەن، بەڵام ئەوانە زیاتر دیارو بەرجەستەن.

ئنجا شایانی باسە زانایان، سوننەتی پێغەمبەریان بەگشتیی کردۆتە دووبەش:

١- سُنَّة تشریع.
٢- سُنَّة غیر تشریع.

---

(١) ص ٢٣٠.
(٢) ج٣، ص٤٨٩.
(٣) ج١، ص٢٩٤-٢٩٥.
(٤) ص ٣٠-٣٩.
(٥) ج٩، ص٣١٧.
(٦) ص ٤٢٧-٤٣١.
(٧) ص ١٢-٨١.

واتە: سوننەتێك كە بۆ ئێمە دەبێتە حوكمی شەرعیی و پابەندكەر دەبێ بۆ ئێمەو، دەبێ جێبەجێی بكەین، سوننەتێكیش كە پابەندكەر نیە بۆ ئێمەو، ئێمە مولزەم نین جێ بەجێی بكەین، هەرچەندە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، یان كردوویەتی.

(شاه ولي الله الدهلوي) لە (حجة الله البالغة)دا دەڵێ:

(إعلم أن ماروي عن النبي "صلى الله عليه وسلم" ودُوِّن في كتب الحديث على قسمين: أحدهما ما سبيله سبيل تبليغ الرسالة، وفيه قوله تعالى:

﴿.. وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ...﴾ الحشر -٧-

وثانيهما: ماليس من باب تبليغ الرسالة، وفيه قوله (صلى الله عليه وسلم): (إنما أنا بشرٌ إذا أمرتكم بشئٍ من دينكم، فخذوا به، وإذا أمرتكم بشئٍ من دينكم، فإنَّما أنا بشر)[1].

(شاه ولي الله الدهلوي) كە زانایەكی زۆر گەورەو موعتەبەر بووە لە كیشوەری هیندیی، دەڵێ: بزانە! ئەوەی كە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بە ئێمە گەیشتوەو، لە كتێبەكانی سوننەتدا نووسراوەتەوە، دوو بەشە: بەشێكیان بریتیە لەوەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك پەیامی خوا گەیاندوویەتی، وەك لە فەرموودەی خوای بەرزدا هاتوە:

﴿.. وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ...﴾ الحشر -٧-

واتە: ئەوەی پێغەمبەر بۆی هێناون، وەریبگرن و، ئەوەی لێتان قەدەغە دەكات، دەستی لێ هەڵگرن..

(دیارە ئەم جۆرەیان جگە لە گەیاندنی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ دەستی تێیدا نەبووە)[2].

---

(١) رواه مسلم: ٢٣٦٢.

(٢) ئەوەی نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

دووەمیان: ئەوەیەکە لە شێوەی گەیاندنی پەیامدا نیە، بەڵکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی ئیجتیهادی کردوەو، ڕای خۆیەتی،وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (بێگومان من بەشەرم، ئەگەر شتێکم پێگوتن لە دینەکەتان لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم لە بۆچوونی خۆم پێگوتن، ئەوە منیش بەشەرێکم وەك ئێوە)، {وە لە ڕیوایەتێکیدا دەفەرموێ: (أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْیاكُمْ) واتە: ئێوە لە کارو باری دنیاتاندا شارەزاترن}[1].

(ابن قتیبة)ش زۆر جوان ئەو مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ:

**{والســنن عندنا ثـلاث:**

١- سنـة أتاهُ بها جبريل "عليه السلام" عن الله تعالى، كقوله: (لا تُنْكَحُ المرأة على عمتها وخالتها)[2]، و (يحرم من الرِّضاع ما يحرم من النسب)[3]، و (لا تُحرِّمُ المصَّةُ ولا المصَّتان)[4] ، و (الدية على العاقلة) }.[5]

واتە: سوننەت لەلای ئێمە سێ بەشە:

یەکەم: ئەو سوننەتەیە کە جیبریل "علیەالسلام" لە خوای بەرزەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئافرەت و خوشکی باب، یان خۆشکی دایك، نابێ بەیەکەوە کۆ بکرێنەوە)، هەروەها فەرموویەتی: (ئەوەی بەشیر پێدان حەڕام دەبێ، هەر ئەوەشە کە بەنەسەب حەڕام دەبێ)، هەروەها فەرموویەتی: (جارێك مژین و دووجار مژین، نابێتە هۆی قەدەغەبوون)، {واتە: ئەو منداڵە نابێتە منداڵی شیریی ژنێك کە جارێك دوو جار مەمکی دەمژێ، تاکو پێنج جاری تەواو لێی

---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) متفق علیە.

(٣) متفق علیە.

(٤) أحمد، ومسلم، وأصحاب السنن.

(٥) متفق علیە.

تیر دەخوات}[1]، هەروەها فەرموویەتی: خوێنی بابای کوژراو، لەسەر خزمانی بکوژە.

{ ٢- **والسنة الثانية:** سنة أباح الله له أن يَسُنَّها وأمره باستعمال رأيه فيها، فله أن يترخَّص فيها لمن شاءَ، على حسب العلّة والعُذر، كتحريمه الحرير على الرجال، و إذنه لعبدالرحمن بن عوف فيه لعلة كانت به.

وكقوله في مكة: (لا تُخْتَلَى خلاها، ولا يُعْضَد شجرُها، فقال العباس بن عبدالمطلب: رضي الله عنه: إلاّ الإذخر فإنه لبيوتنا، فقال: إلاّ الإذخر...)[2]، ونهى عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث، وعن زيارة القبور، وعن النبيذ في الظروف، ثم قال: (إني نهيتكم عن إدِّخار لحوم الأضاحي فوق ثلاث، ثم بدا لي أن الناس يُتْحِفون ضيفَهم، ويحتسبون لغائبهم، فكلوا وأَمْسِكوا ما شئتم، ونهيتكم عن زيارة القبور، فزوروها ولاتقولوا هُجْراً، فإنه بدا لي أنه يُرِقّ القلوب، ونهيتكم عن النبيذ في الظروف، فاشربوا ولا تشربوا مُسْكِراً) }[3]

واتە: جۆری دووەمی: سوننەت ئەوەیە کە خوا "سبحانە وتعالی" بۆ پێغەمبەری (صلی اللە علیە وسلم) ڕەوانەکردوە، کە ڕای خۆی تێدا بەکار بێنێ و ئیجتیهادی تێدا بکات و، بۆ هەرکەسێك ئەگەر عوزرێکی هەبوو، لەوشتانە مۆڵەتی بدات، بۆ وێنە: ئاوریشمی لە پیاوان قەدەغەکردوە، بەڵام دوایی بۆ (عبدالرحمن بن عوف) ڕوخسەتی داوە لەبەری بکات، چونکە بەدەنی خرووی هەبوو، {یانی: ئەگەر خوا قەدەغەی کردبایە، هەڵاواردنی تێدا نەدەبوو، کەواتە: ئەوە ئیجتیهادی خۆی بووە}[4].

هەروەها وەك ئەوە کە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ڕۆژێك فەرمووی: (نابێ گیای سەوزی مەککە ببڕن و، نابێ درەختەکەشی بقرتێنن، (عباس بن عبدالمطلب) مامی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)یش گوتی: ئەی پێغەمبەری

---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) متفق علیه.

(٣) مسلم: ٩٧٧، والحاکم، وأحمد صحیح الجامع: ٤٥٨٤.

(٤) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

خوا! جگە لە گیای (ئیذخەر)، چونکە پێویستمانە بۆ خۆڵەبان و سەرگرتنی خانوەکانمان، فەرمووی: جگە لە ئیژخەر.

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەیکرد کە لە سێ ڕۆژان زیاتر گۆشتی قوربانیی هەڵبگیرێ، {لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەو سەروحەدەدا، خەڵکی غەوارەو دوور وڵات زۆربوون}[١] و لێی قەدەغەکردن زیارەتی گۆڕستان بکەن و، لێشی قەدەغەکردن کە خۆشاو لە کوندەو مەشکەدا هەڵبگرن، بەڵام دوایی فەرمووی: پێشتر لێم قەدەغەکردبوون، کە گۆشتی قوربانیی پاشکەوت بکەن و هەڵیبگرن، پاشان بۆم دەرکەوت، کە خەڵك دەیدەنە میوانیان و، بۆ کەسێکیان کە لە ماڵ نیەو لە سەفەرێیە هەڵیدەگرن، دەجا ئێستا بە کەیفی خۆتان بخۆن و پاشکەوتیشی بکەن و. پێشتر ڕێم لێگرتبوون بچنە سەر گۆڕستان، بەڵام ئێستا بچن، بەڵام قسەی خراپ مەکەن (واتە: لە مردووەکان مەپاڕێنەوەو قسەی غەڵەت و پەڵەت مەکەن)[٢]، چونکە بۆم دەرکەوت کە سەردانی گۆڕستان دڵتان نەرمدەکات، (پێشێ لەوە ترساوە کە تووشی شیرك ببن، دوایی کە زانیویەتی لە ئیسلام و تەوحید حاڵیبوون، وەسەردانی گۆڕستان ئەو حیکمەت و سوودەی تێدایەو حیکمەت و سوودەکەش دێتەدی، بێ ئەوەی کە مەترسیی هەبێ، کەواتە بابچن)[٣]، هەروەها ڕێم لێگرتبوون کە خۆشاو لە کوندەو مەشکەدا هەڵبگرن، قەیناکات تێیدا هەڵبگرن و بخۆنەوە، بەڵام خۆتان بپارێزن لەشتی سەرخۆشکەر.

{ **٣- السنة الثالثة:** ما سَنَّهُ لنا تأديباً، فإنْ نحن فعلناه كانت الفضيلة في ذلك، وإنْ نحن تركناه، فلا جناح علينا ان شاء الله، كأمره في العِمَّة بالتلحّي، وكنهيه عن لحوم الجلاّلة، وكسب الحجّام.}[٤]

---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٣) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٤) بڕوانە: تأويل مختلف الحديث، ص ١٩٦-١٩٨..

جۆری سێیەمی سوننەت: ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك ئەدەبێك بۆ ئێمە دایناوە، ئنجا ئەگەر بیکەین، ئەوە چاکمان کردووە، ئەگەر نەشیکەین، هیچ گوناهمان ناگاتێ، ئەگەر خوا بیەوێ، بۆنموونە: فەرمانی کردوە کە کەسێك عەمامەی لەسەرنا، لایەکی لەملیەوە بپێچێ و بەژێر چەناگەیدا بیهێنێ و، ڕێگریی کردوە لە خواردنی گۆشتی هەر پەڕەور و ئاژەڵێك کە پیسایی بخوات و، کەسێك کە کەڵەشاخ لە خەڵك دەگرێ، پارە وەربگرێ، (کە دیارە هەرکام لە: مێزەر (عمامة) بەژێر چەناگەدا هێنان و، نەخواردنی گۆشتی پەڕەور و ئاژەڵی پیسایی خۆر و، وەرنەگرتنی پارە لە بەرانبەر کەڵەشاخ گرتن دا، پێویست (واجب) نین، بەڵام شتی پەسند و ئەدەبی بەرزن)[١].



---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

# دابەشبوونی سوننەت بۆ شەش جۆری سەرەکیی

**بەڕێـزان!** وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە: سوننەت دەبێتە شەش بەش، کە هەرکام لەو شەش بەشە، ئەگەر زۆر وریانەبین و، وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا نەکەین، دینداریبەکەمان لیَ تێك دەچێ و، دنیاداریبەکەشمان لیَ تێك دەچێ و، دەبینە گاڵتەجاڕی خەڵك، وەك ئێستا دەبینین ئەو ئیسلامەی کە سەرتاپا نوورو ڕەحمەت و بەرەکەتە، ئەو ئیسلامەی کە هاتوە هەموو بەشەر بەختەوەر بکات، ئێستا مسوڵمانان خۆیان بەدەستیەوە گرفتار بوونە!

هەڵبەتە ئەو ئیسلامە نا، کە خوا ناردوویەتی، بەڵکو ئەوە تێگەیشتنی هەڵەی ئێمەیە لە ئیسلام، ئەوە حاڵیبوون و کەچ فەهمیی ئێمەیە دەربارەی ئیسلام، کە وایکردوە خۆشمان گرفتاربین و، خەڵکیش بەدەست خۆمانەوە گرفتار بکەین، لەجیاتی ئەوەی ببینە مایەی ڕەحمەت بۆخۆشمان و بۆ خەڵکیش!!

جۆری یەکەمی سوننەت: سوننەتی یاسادانان و گەیەنرانە بەپێی داخوازیی پێغەمبەرایەتیی و ڕەوانەکراوێتیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (سنة للتشريع و التبليغ بمقتضى نبوتة ورسالتة):

کە بریتیە لەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك وەحیی خوا ڕایگەیاندوە، بۆ وێنە: کە فەرموویەتی:
**(بَلِّغُوا عَنِّي ولَوْ آيَةً).**[١]

واتە: ئایەتێکیش بێ، لەمنەوە بیگەیەنن بە خەڵك.
ئەوە گۆڕینی بەسەردانایەت و، پەیوەندیی بە هەموو مسوڵمانێکەوە هەیەو، لەهەموو حاڵاندا پابەندکەر (مُلْزِم)ە بۆ سەرجەم مسوڵمانان. هەڵبەتە ئەسڵیش لە سوننەت دا ئەم جۆرەی یەکەمە.

جۆری دووەمی سوننەت: سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرە، بە حوکمی پێشەوایەتیی و سەرۆکایەتیی (سنه بمقتضى إمامته و رئاسته):

ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەحوکمی ئەوە کە سەرۆکی دەوڵەت بووە، کردوویەتی و وەك پێشەوای مسوڵمانان و سەرکردەی مسوڵمانان کردوویەتی، بۆ وێنە کە فەرموویەتی:
**(من أحيا أرضاً ميتة فهي له).**[٢]

واتە: هەرکەسێك زەوییەکی مردوو (بەیار) زیندوو بکاتەوە، ئەوە با بۆخۆی بێ، یان کە فەرموویەتی:
**(من قتل قتيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ).**[٣]

واتە: هەرکەسێك کەسێك بکوژێ لەجەنگدا، ئەوە کەل و پەلەکەی بۆخۆی.

---

(١) البخاري: ٣٤١٦.
(٢) أبو داود: (١٧٨/٣)، والترمذي: (١٤٦/٦) والنسائي: في الكبرى: (٣٢٥/٣)، وأحمد: (٣٣٨/٣).
(٣) متفق عليه.

کە بێگومان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك سەرۆكی دەوڵەت ئەوەی فەرمووە، بۆیە هەر مەلاو زانایەك و هەركەسێك ڕاستبۆوە، بۆی نیە بڵێ: هەركەسێك كوێ دەكێڵێ و با بیكێڵێ!نا، چونكە ئەوە دەبێتە پاشاگەردانیی،چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك سەرۆكی دەوڵەت ئەوەی فەرمووە، كەواتە: تەنیا سەرۆكی دەوڵەت واتە: حكومەت و دەستەڵات، مافی ئەوەی هەیە كە زەوی بەخەڵك بدات و، مافی ئەوەی هەیە كە بەجەنگاوەرەكان بڵێ: هەرچی گرتتان بۆخۆتان.

جۆری سێیەمی سوننەت: ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەرە بە حوكمی قازیی و دادوەر بوونی (سنة بمقتضی كونه قاضیا وحاكما):

ئەویش ئەوەیە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك قازیی و دادوەر فەرموویەتی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەندێك شتی بڕیارداوە وەك قازیی و دادوەر، ئنجا ئەو حوكم و بڕیارانە، هەركەسێك ڕاستبۆوە، بۆی نیە بیانڵێ، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی:

**(إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فمن قضيت لَهُ بشيءٍ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ فَلاَ يَأْخُذْه، إِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ).**[١]

واتە: ئێوە ناكۆكییتان دەبێ و دێنە لای من، منیش دادوەرییتان لەنێواندا دەكەم، ڕەنگە یەكێكتان قسەزانتر بێ لەوی دی (مەبەستی خۆی باشتر دەخاتە ڕوو، هەرچەندە ناحەقیشی بێ)[٢] ئنجا كە حەقی برایەكەی دەدەم بەو، با وەرینەگرێ، (من ڕواڵەت دەبینم بەڵام لەلای خوا نابێتە حەق، كە دەزانێ لەسەر ناحەقە)[٣]، ئەوە پارچە ئاگرێكە بۆی دەبڕم.

---

(١) رواه البخاري و مسلم.

(٢) ئەوەی نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

(٣) ئەوەی نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

یانی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر کاتی خۆی بڕیارێکی دابێ بۆ کەسێك و دوایی دەرکەوتبێ، کە ئەو کەسە کە بڕیارەکە لە قازانجی دراوە، ڕاستی نەکردوە، ئێستا بەهۆی بڕیارەکەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) نەبۆتە خاوەن حەق و، هیچ کەس بۆی نیە هەمان ئەو بڕیارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دووبارە بکاتەوە بۆ یەکێکی دیکە، بۆچی؟ چونکە کاتی خۆی وەك قازیی ئەو بڕیارەی داوەو وای بۆ دەرکەوتوە، نەك حوکم و بڕیارێکی گشتی بێ.

## جۆری چوارەمی سوننەت: ڕێبازی پێغەمبەرە بە حوکمی موفتی بوونی (سنه بمقتضى كونه مفتيا):

ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك موفتی فەرموویەتی و فەتوای داوە، بۆ وێنە با سەرنجی ئەم دەقە بدەین:

**(قَالَتْ هِند بنت عتبة: يا رسول الله "صلى الله علية وسلم" إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ و انه لايعطيني ما يكفيني وبنيَّ، الا ما أخذت منه وهو لايعلم، فَهَلْ عَلَيَّ فِي ذلك جُنَاحٌ؟ فقال: خذي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ).**[1]

واتە: هیندی کچی عوتبە (واتە: هاوسەری ئەبوسوفیان) چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەبوسوفیان پیاوێکی چرووکە، هێندەم ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات و پێی بژین، مەگەر ئەوەی کە لێی گلدەمەوە، بێ ئەوەی پێی بزانێ، ئایا گوناهم دەگاتێ؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: بایی ئەوەی کە بەشێوەیەکی چاك (پارەکە) بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات، لێی گلدەوە قەیناکات.

ئنجا بەگوێرەی ئەو فەتوایە: ئایا ئەگەر ژنێك سکاڵای چرووکیی و ڕژدیی و چەنگ قووچاویی مێردەکەی خۆی لەلای ماموٚستاو زانایەك کرد،

-----------------------------

(١) متفق عليه.

مامۆستاو زانایەکە بۆی هەیە بڵێ: بەکەیفی خۆت پارە لە سامانی مێردەکەت ببە؟! نەخێر، چونکە دیارە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەحقیقی کردوەو زانیویەتی ئافرەتەکە ڕاست دەکات و، زانیویەتی کە ئەبو سوفیان چرووکە، بۆیە ئەو فەتوایەی بۆ داوە.

کەواتە: بۆمان نیە هەمان ئەو فەتوایە دووبارە بکەینەوە، بەڵێ ئەگەر حاڵەتەکە بخوێنینەوەو، هەمان ئافرەتێکی وابێ، کە ڕاست بکات و مێردەکەشی وابێ، ئەوجار ئەو فەتوایە جێی خۆی دەگرێ، ئەگەرنا جاری واهەیە ئافرەتەکە دەیەوێ ماڵی مێردەکەی بەناحەق بخوات، بەتەماعەو دەیەوێ ماڵەکەی بخوات و، دەچێتە لای مامۆستایەك، ئەگەر فەتوای بۆ بدات، ئەوە فەتوایەکی هەڵەو سەقەتی داوە.

**جۆری پێنجەمی سوننەت: سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرە بەپێی کۆشش کردنی لە کاروباری دنیادا، وەك کشتوکاڵ و پزیشکیی و جەنگ (سنة بمقتضى اجتهاده في الأمور الدنيوية، كالزراعة و الطب والحرب):**

ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك کاروباری دنیایی ئیجتیهادی کردوە، چونکە ئەویش وەك ئێمە بەشەر بووە وەك خوا فەرموویەتی کە بفەرموێ:

﴿ .. إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ .. ﴾ فصلت -٦-

ئەویش ئیجتیهادی کردوەو بیری کردۆتەوە بە عەقڵی خۆی وشتێکی وا بەچاك زانیوە، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەجەنگی بەدردا فەرمووی: با بارگەو بنە لێرە بخەین، سوپای ئەبوجەهل هەزار کەس بوون و لە مەککەوە هاتبوو، سوپای مسوڵمانانیش لە مەدینەوە هاتبوو، ئنجا حەبابی کوڕی مونزیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە کە لێرە بارگەو بنەمان خستوە، ئەوە وەحیی خوایە، یان تاکتیکی جەنگییە؟ فەرمووی: هەرتاکتیکی جەنگییەو ڕای خۆمە، گوتی: ئێرەباش نیەو شوێنێکی دیکەی پێشنیارکرد،

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پاش گوێ بۆگرتنی و قەناعەت هاتنی بەقسەکانی پێشنیارەکەی لێوەرگرت و تەبەنیی کرد.

تەماشا بکەن! هاوەڵان چۆن پەروەردەکراون، فێری ئازادیی بیروڕاکراون، فێری جورئەت کراون، بەڵام لەهەمانکاتدا فێری ئەدەبیش کراون: (الحباب بن المنذر) یەکسەر ڕەخنەی نەگرت، بەڵکو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئەوە وەحییە؟ یانی: ئەگەر وەحیی بێ، خوا لەهەمووان چاکتر دەزانێ، بەڵام ئەگەر وەحیی نەبێ، ئێمەش عەقڵمان هەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: نا، وەحیی نیە، بەعەقڵی خۆم وام پێ چاك بوو، ئەویش گوتی: دەجا ئێرە باش نیە[1]، حەبابی کوڕی مونزیر دیارە لە تەکتیکی جەنگیی لێی زانیوە، لەو مەسەلەیەدا ئەگەر لە پێغەمبەری خوا چاکتری لێ زانیبێ، هیچ نوقسانیی نیە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆ پێغەمبەری خوا نەهاتوە، ئێمە فێری جەنگ بکات، هاتوە ئێمە فێری دینداریی و، خوا پەرستیی و، فێری ژیانێك بکات کە شایستەی مرۆڤە، بەڵام نەهاتوە ئێمە فێری پزیشکیی و ئاسنگەریی تەکنۆلۆژیاو هونەری جەنگیی و....هتد بکات!

ئنجا هەر لێرەشدایە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

**(أَنْتُــم أعْــلم بأمْــرِ دنيــــاكم).**[2]

واتە: ئێوە شارەزاترن لە کاروباری دنیاتاندا، ئایا ئەوەی لە چی کاتێکدا فەرمووی؟ ڕۆژێك بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆیشت دارخورمایان موتوربە (تلقيح، تأبير) دەکرد، تۆوی نێرەکەیان دەبردە سەر مێیەکەی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پێموایە گەر واش نەکەن زەرەری نەبێ، ئەوانیش دەستیان لێ هەڵگرت، پێغەمبەر نەیفەرموو: وامەکەن، بەس تەماشایکرد، ئەو دارخورمایە بەرزەو، دەچن تۆوی نێرەکەی دەبەنە سەر مێیەکە، لە دڵی خۆیدا فەرموویەتی: زۆر خۆیان ئەزیەت دەدەن، ڕەنگە ئەگەر واش نەکەن زەرەری

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص١٣٦.

(٢) مسلم: ٢٣٦٣.

نەبێ و دارخورمایەکان هەر بەربگرن، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شارەزا نەبوو، چونکە لە مەککە دار خورمای لێ نەبوون، بەڵام لە مەدینە دارخورمای لێبوون، ئنجادوایی دار خورمایەکان بەریان نەگرت، ئەوانیش چوونەوە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! دارخورمایەکان بەریان نەگرت!

فەرمووی: بۆچی بەریان نەگرت؟

گوتیان: لەبەر ئەوەی موتوربەمان نەکردن، فەرمووی: بۆچی موتوربەتان نەکردن؟

گوتیان: تۆ بەوێدا هاتی فەرمووت: ئەگەرواش نەکەن زەرەری نیە.

ئەویش فەرمووی: ئەگەر شتێکم پێگوتن وەك دین، لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم بە ڕای خۆم پێگوتن، ئێوە لەکاروباری دنیایی خوتاندا شارەزاترن.[1]

کەواتە: تەمبەڵ تەمبەڵ لێی دامەنیش، چاوەڕێ بکەن ئایین هەموو شتێکتان فێربکات، ئایین ئەو شتەتان فێردەکات کە لەمەودای عەقڵتاندا نیە، بەڵام پێویست ناکات فێرت بکات: چۆن میکرۆ فۆن و فرۆکەو ڕۆکێت و سەیارەو تەلفزیۆن و ڕادیۆ، دروستبکەی،ئیسلام نەهاتوە ئەوەت فێربکات،کە لەمەودای عەقڵی بەشەردایە، بەڵکو هاتوە، ئەوەت فێربکات کە لەدەرەوەی مەودای عەقڵی بەشەرە: ناسینی خوای پەروەردگار، ئیمان بەخوا، ئیمان بەڕۆژی دوایی، ئیمان بەفریشتەکانی خواو، کتێبەکانی و، پێغەمبەرەکانی، عیبادەت و ئەخلاق و، حەڵاڵ و حەڕامی سەرەکیی و، شتە بنەڕەتییەکان، بەڵام وردە بابەتە دنیایی یەکان، نا، کە خەڵك تەنبەڵ و تەوەزەل بکات و عەقڵ و هۆشی خۆیان بەکارنەهێنن، بۆیە کاتێك مسوڵمانان دەرگای ئیجتیهادیان لەسەر خۆیان داخست، بەودەردە چوون کە ئێستا دەیبینن.

---

(١) ئەو فەرمایشتانەمان بە هەرسێك ڕیوایەتەکانیەوە، لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا هێناوە، بڕوانە: چاپی شەشەم.

جۆری شەشەمی سوننەت: ڕێبازی پێغەمبەر بەپێی داخوازی سروشتی بەشەریی، وەك حەزكردنی لە شیرینی و هەنگوین (سنة بمقتضى جبلته البشريه كحبه للحلوا و والعسل):

ئەویش بریتیە لەوە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك سروشتی بەشەریی شتێكی پێخۆشبووە، یان پێی ناخۆش بووە، یان جۆرە بەرگێكی لەبەردابووە، وەك قەومەكەی خۆی، بۆوێنە: دایكمان عائیشە گوتوویەتی:

**(كان صلى الله عليه وسلم يحب الحَلْواءَ و العسل).**[(١)]

واتە: پێغەمبەری خوا، حەلواو هەنگوینی پێخۆشبووە، ئنجا ئایا سوننەتە هەركەسێك ڕاستبۆوە بچێ حەلواو هەنگوین بخوات، با نەخۆشی شەكرەشی هەبێ؟ بێگومان نەخێر، ئنجا ئەوە بۆ خۆشیی بۆتان دەگێڕمەوە: پێشمەرگەیەكمان هەبوو لە خورماڵ، وایزانی بوو خورما خواردن سوننەتە، ئەوەندەی خورما خواردبوو، هەموو مەعیدەی سووتابوو، تووشی نەخۆشیی بوو بوو، زۆر بەزەحمەت چاك دەبوو، دوایی بەڕەحمەتی خوا چوو "خوا عەفووی بكات".

كەواتە: دەبێ بزانی چۆن بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەكەوی! دەبێ عاقڵانە بەدوای بكەوی، ئەگەرنا بچی بەناوی سوننەتەوە، هەندێك شت بكەی كە بۆتۆ سوننەت و پابەندكەر نیە، ئەوە لە ڕاستییدا ئەو ڕەفتارەت دەبێتە هۆی بێزراندن وشێواندن (تشويه)ی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

---

(١) متفق عليه.

## ٧- بەرهەمی مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ سوننەتدا:

هەركات مامەڵەی ڕاست و دروستمان لەگەڵ سوننەت دا كرد، چەند بەرهەمێكی گرنگمان دەستگیر دەبن، كە دەتوانین بڵێین: لە دوو خاڵان دا بەرجەستە دەبن:

**یەك: دانانی هەركام لە بەشەكانی سوننەت، لە شوێنی شایستەی خۆیدا:**

هەركات ئیمە مامەڵەی ڕاست و دروستمان لەگەڵ سوننەتدا كرد، یەكەمین شتێك كە دەستمان دەكەوێ، ئەوەیە كە هەركام لەبەشەكانی سوننەت، لەشوێنی خۆیاندا دادەنێین، لەوبارەوە (القرافي) لەكتێبەكەی خۆی (الإحكام)دا دەڵێ:

**١- (فما فعله صلى الله عليه وسلم بطريق الإمامة كقسمة الغنائم، و تفريق أموال بيت المال على المصالح، وإقامة الحدود، و ترتيب الجيوش، وقتال البغاة، و توزيع الإقطاعات في القرى و المعادن ونحو ذلك، فلا يجوز لأحد الإقدام عليه، الا بإذن إمام الوقت الحاضر...).**

واتە:

١- ئەوەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك پێشەوایەتیی و سەرۆكی دەوڵەت كردوویەتی، وەك: دابەشكردنی دەسكەوتەكانی جەنگ، یاخود ماڵ و سامان دابەشكردن بەسەر بەشەكاندا (بودجە دابەش كردن بەسەر وەزارەتەكاندا)،وە جێبەجێ كردنی سزا شەرعییەكان (وەك سزایەكانی دزیی و زینا و قەتڵ و ڕێگریی) و، ئامادەكردنی سوپاو، جەنگ كردن لەگەڵ یاخی بووان و، دابەشكردنی زەویی و زارو دابەشكردنی كانزایەكان و وێنەی ئەوانە، ئەوە هیچ كەس بۆی نیە ئەو كارانە بكات، مەگەر بەمۆڵەتی ئەو كەسە كە سوڵتەی شەرعیی بەدەستە لەوكاتەدا، (یان دەبێ خۆی بیكات، یان بەمۆڵەتی وی بكرێ).

٢- (وما فعله عليه السلام بطريق الحكم كالتمليك بالشفعة، وفسوخ الأنكحة و العقود، و التطليق بالإعسار، والإيلاء عند تعذر الإنفاق، والفيئة و نحو ذلك، فلايجوز لأحد أن يقدم عليه الا بحكم الحاكم في الوقت الحاضر اقتداء به...)[١]

واتـــە:

٢- ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردوویەتی بەسیفەتی حاکم و قازیی، وەك: خاوەندارکردن بەهۆی (شُفْعَە)ەوە (دوو ماڵ کە دراوسێ بن، یەکیان ئەگەر خانووەکەی بفرۆشێ، دراوسێیەکەی لێی لەپێشترە) و، هەڵوەشانەوەی نیکاحەکان و گرێبەستەکان و، کەسێ کە نەفەقەی ژنەکەی ناکێشێ لەبەر تەنگ دەستیی، حاکم بۆی هەیە پێی تەڵاق بدات، یاخود ئەگەر سوێندی لێ خوارد نەچێتە لای و وەختەکە تێپەڕی، قازیی بۆی هەیە پێی تەڵاق بدات و، وێنەی ئەو جۆرە شتانە، هیچ کەسێك بۆی نیە ئەو کارانە بکات، مەگەر قازیی و دادوەر بێ، ئەگەر نا هەرکەس ڕاست بۆوە، بۆی نیە ئەو شتانە بکات، چونکە دەبێتە فەوزا و پاشا گەردانیی.

٣- (وأما تصرفه "عليه الصلاة والسلام" بالفتيا أو الرسالة والتبليغ، فذلك شرع يتقرر على الخلائق الى يوم الدين، يلزمنا أن نتبع كل حكم مما بلـغه إلينا عن ربه بسببه، من غير اعتبار حكم حاكم ولا إذن إمام...).

واتـــە:

٣- بەڵام ئەوەی پێغەمبەر وەك فەتوا پێی فەرمووین، یان وەك پەیامی خوا پێی ڕاگەیاندووین، ئەوە شەریعەتێکی پابەندکەرە بۆ خەڵك، لەهەموو کات و شوێنەکاندا، تاکو ڕۆژی دوایی، وەپەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، سەرۆکی دەوڵەت چی دەڵێ و، قازیی چی دەڵێ.

{وەك ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بەحاڵەتی ئەحوال شەخسیی و، حاڵەتی عیبادەتی شەخسیی ئەو شتانەوە هەیە، کە بەتاکەکان ئەنجام دەدرێن}[٢].

---

(١) الإحكام: ص١٠٨.

(٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

کەواتە: بەهۆی مامەڵەکردنی ڕاست و دروست لەگەڵ سوننەت دا، ئەوەمان دەست دەکەوێکە بەشەکانی سوننەت لەجێی خۆیان دا دابنێین.

**دوو: ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەك و پارێزران لە تێپەڕاندن و بەزایەدان:**

هەروەها بەهۆی ڕاست و دروست مامەڵەکردنەوە لەگەڵ سوننەتدا، چەند هەڵەیەك کە بەهۆی تێنەگەیشتن لەسوننەتەوە گیرۆدەیان بووین، ڕاستیان دەکەینەوە، بۆوێنە:

١- مەسەلەی شێوازی نانخواردن:

ئێستا هەندێ کەس پێیان وایە کە هەرئەوان بەدوای ڕێبازی پێشینی چاك و سوننەتی پێغەمبەر دەکەون وبە: (ناوی سەلەفیی لەخۆنان) خۆیان لە مسوڵمانان جیاکردۆتەوە، ئنجا هەندێك[1] کەس لەوانە هەندێك بیروڕای سەیر سەیریان هەن، کە یەکێکیان ئەوەیە دەڵێن: دەبێ بەس بەدەست نان بخورێ و، بەکارهێنانی کەوچك و چەنگاڵ و چەقۆ، بیدعەتە و، دەبێ لەسەر زەوی نان بخورێ و، لەسەر مێزو کورسی دروست نیە! ئنجا لە کاردانەوەو لەبەرانبەر ئەواندا، هەندێکی دیکە هەن دەڵێن: بە دەستی ڕاست دەخۆی، یان بەچەپ دەخۆی، هەرچۆن دەخۆی، لەپێش خۆت دەخۆی، لەملاولا دەخۆی، وەك یەکە! کە بێگومان ئەم دووانە، یەکیان تێپەڕاندن و، ئەوی دیکەیان بەزایەدانە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی دیاریی نەکردووین کە دەبێ هەربەدەست بخۆین، بەلام فەرموویەتی:

**(ياغلامُ، سَمِّ اللّه، وكُلْ بيمنك، وكلْ ممّا يلِيك).**[2]

واتە: کوڕیژگە! ناوی خوا بێنە {بسم الله) بکە} و بەدەستی ڕاستت بخۆ، و لەپێش خۆتەوە بخۆ، بەلام نەیفەرمووە: با چەنگاڵت پێنەبێ و، بەکەوچکێ مەخۆ، ئەگەر چێشتەکە شل بێ، چۆن بەدەستی دەخورێ؟

---

(١) گوتوومە (هەندێک کەس لەوانە) نەک هەموویان!

(٢) متفق عليه.

کەواتە: ئەوەی کە دەڵێ: کەیفی خۆتە بەدەستی ڕاست یان بەچەپ دەخۆی، ئەوە ڕاست ناکات و، تووشی بەزایەدان (تفریط) بووە و، ئەویدیکەش تووشی تێپەڕاندن (إفراط) بووە.

٢- مەسەلەی بەتەنیا لە قاپێکدا خواردن، یان بەکۆمەڵ لە دەفرێکدا:

کەسی واهەیە پێی وایە ئەو شێوازە بە بیدعەت دادەنرێ، ئەگەر بێت و هەرکەسە لە قاپێکی تایبەتدا نان بخوات و، پێیان وایە سوننەت وایە: ژمارەیەك پێکەوەو لە دەفرێکدا بخۆن، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەر و هاوەڵاندا وابووە! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیەو، ئەوکاتە بۆیە وابووە، چونکە کەل و پەل کەم بووە و هەژاریی و نەداریی بووە و هیچ دەقێکمان نیە ڕێ لە نان خواردنی بەتەنیا بگرێ.

٣- مەسەلەی بەرگ و پۆشاك:

هەندێك پێیان وایە سوننەتە پۆشاکێکی تایبەت، کە پۆشاکی عەرەبییە، بپۆشی! لەساڵی (٢٠١٢)ز دا سەفەری ئەڵمانیام کرد، لەشاری بەرلین یەکێکم بینیی مسوڵمان بوو بوو، کڵاوێکی لەسەر نابوو، بەرگێکی شۆڕەی لەبەر کردبوو، وەك بەرگی عەرەبیی، منیش گوتم: ئەو برایە ناوی چیە؟

گوتیان: ئەوە ناوی یوحەننا بووە، ئێستا ناومان ناوە یەحیا.

گوتم: باشە موبارەکە، ئەدی ئەو بەرگە چییە لەبەریدا، خەڵکی کوێیە؟

گوتیان: خەڵکی ئەڵمانیایە.

گوتم: ئەدی بۆچی واتان لێکردوە؟

گوتیان: ئاخر ئەوە سوننەتە! ئەدی سوننەت نیە بەرگی شۆڕەی لەبەر بێ و، کڵاوی سپی لەسەر بێ و، نەعلی لەپێ بێ؟

گوتم: بەڕێزان! ئەو شتانە پەیوەندییان بەعادەتی خەڵکەوە هەیە، ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەم ئەڵمانیایە بووایە، بێگومان بەرگی ئەڵمانیەکانی

لەبەر دەکرد، ئەگەر لە ئەسکیمۆ بووایە، بەرگی خەڵکی وێی لەبەر دەکرد، ئەگەر لەقەفقاسیا بووایە، بەرگی ئەوێی لەبەر دەکرد، پێغەمبەری خوا بۆیە بەرگی عەرەبیی لەبەرکردوە، چونکە خۆی لە گەلەکەی جیانەدەکردەوەو، ئەو شتانە چ پەیوەندییەکیان بە سوننەتەوە هەیە؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆیە خورمای خواردوە، چونکە ئەو شوێنە خورمای لێبوە، بۆیە بەزۆری نەعلی لەپێ کردوە، چونکە کەش وهەوای شوێنەکە واهەڵدەگرێ، نەعل لەپێ بکات، بەڵام ئایا ئەگەر لە شوێنێکی ساردی وەك (سیبریا) بووایە نەعلی لەپێ دەکرد؟!

### ٤- مەسەلەی دامێن و دەلینگ هەڵپێچان (تشمیر الثوب):

با سەرەتا لەوبارەوە سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین:

**(عن أبي هريرة عن النبي "صلى الله علية وسلم" قال: ما أسفل من الكعبين من الإزار ففي النار).**[١]

واتە: هەرچی لە دامێن، لەخوار گوێزینگانەوە بێ، لە ئاگردایە.

بێگومان لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پۆشاكی عەرەبییە، کە شۆڕەیەو دامێنی هەیەو دادەکەوێ، نەك پانتۆڵ (بنطلون) یان شەرواڵ (سَرْوال).

چونکە وشەی (إزار) کە لە فەرموودەکەدا هاتوە، بریتیە لەو پۆشاکەی کە نیوەی خوارەوەی جەستە - لە پشتێن بەرەژێر - دادەپۆشێ، وەك (المعجم الوسيط) گوتوویەتی: (الإزار: ثوب يحيط بالنصف الأسفل من البدن، يذكر و يؤنث)[٢].

ئنجا حیکمەت و هۆکاری ئەوەش کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای فەرمووە، ئەوە بووە کە لەنێو گەلی عەرەب دا - بەتایبەت دەوڵەمەندەکانیان

---

(١) رواه البخاري: ٥٧٨٧.

(٢) ص ١٦.

دا- عادەتێك هەبووە، کە بریتی بووە لە: درێژکردنی پۆشاك و لەدوای خۆ ڕاکێشانی، تەنانەت هی وابووە چەند بستێك یان مەترێك پۆشاکەکەی بەدوای داخشاوەو، نەفەری تایبەتی هەبووە بۆ هەڵگرتنی و لەدوا ڕۆیشتنی! بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

**(لاينظر الله يوم القيامة إلى مَنْ جَرَّ إزارَهُ بَطَراً).**[١]

واتە: خوا ڕۆژی قیامەتێ تەماشای کەسێك ناکات، کە بە فیزو کەشخە پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ.

کەواتە: کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڕەشەی ئاگری دۆزەخی لە پۆشاك شۆڕکردنەوە، کردوە، ئەوەی مەبەست بووە، ئەمما تۆ بەرگی کوردیی لەبەر دەکەی، یاخود چاکەت و پانتۆڵ، بڵێین: نابێ بەلەك و گوێزینگت دیاربێ! دوایی سەرما لێی دەدا و تووشی نەخۆشیی دەبی و، سەربارەش دیمەنێکی نارێك دێتە بەرچاو! کەواتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بۆ بەرگێکی دیکە فەرمووەو پێویستە باش لە پێغەمبەری خوا تێبگەین و فەرموودەکانی لە شوێنی تەرخان و گونجاوی خۆیان دا بەکاربێنین.

هەروەها بەپێی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەو ڕەخنە گرتن و هەڕەشەیە لە پۆشاک شۆڕکردنەوەش، ڕووی لە کەسێکە کە بەفیز و کەشخە ئەوە دەکات، نەک بێ ئەوەی مەبەستی بێ، دامێنی پۆشاکەکەی دابکەوێ:

**با سەرنج بدەین:**

**( عن إبن عمر رضي الله عنهما أن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: مَن جَرَّ ثَوبَهُ خُيَلاءَ لم ينظرِ الله إليه يوم القيامة، فقال أبو بكرٍ: يا رسول الله إنَّ إزاري يَسْتَرخي إلّا أن أَتعاهَدَهُ، فقال له رسولُ الله: إنك لَستَ مِمَّن يَفعَلَهُ خُيَلاءَ).**[٢]

---

(١) البخاري: ٥٧٨٨ و مسلم: ٢٠٨٧.

(٢) رواه البخاري: ٣٦٦٥، و مسلم بعضه: ٢٠٨٥.

واتە: هەر کەسێک بە فیز و کەشخەلێدان پۆشاکەکەی ڕابکێشێ، خوا ڕۆژی قیامەت تەماشای ناکات، ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) من کراسەکەم هەر دادەکەوێ (شۆڕدەبێتەوە) مەگەر ئاگام لێبێ! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بێگومان تۆ لەو کەسانەنی کە بە فیز و خۆنواندن وادەکەن.

٥- مەسەلەی بۆیەکردنی سەرو ڕیش:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

(إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لا يَصْبِغُونَ فَخَالِفُوهُمْ).[١]

واتە: جوولەکە و نەصرانیی، مووەکانیان بۆیە ناکەن، ئێوە بەپێچەوانەی وانەوە ڕەفتار بکەن (بۆیە بکەن).

ئنجا ئایا لەسەر مسوڵمانان فەرزە، ئەگەر پیاون، سەرو ڕیشی خۆیان بۆیە بکەن، ئەگەر ئافرەتن، قژی خۆیان بۆیاغ بکەن؟ نەخێر! چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: جوولەکە و نەصرانییەکان بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەی ئەوان بجووڵێنەوە، ئەدی ئەگەر ئەوان کردیان؟ دیارە دەبێ تۆ نەیکەی، کەواتە: ئەوە پەیوەندیی بە عادەت و عورفەوە هەیەو، ئەوکاتە ئەو ڕەفتارە بۆیە فەرمانی پێکراوە، تاکو مسوڵمانان لەغەیری خۆیان جیابنەوە، بەڵام ئێستا مسوڵمانان بەشتی دیکە جیادەبنەوە.

---

(١) رواه أحمد: ٩٢٠٩، و البخاري: ٥٥٥٩، و مسلم: ٢١٠٣، و أبوداود: ٤٢٠٣، و النسائي: ٥٠٦٩، و ابن ماجه: ٣٦٢١.

٦- لەڕووی پزیشکیی (طبّي)ەوە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

( عـلـيـكم بـــالإثـــمَــدِ.. ).[1]

واتە: (إثـمَـد) بەکاربێنن، کە جۆرە کلێکە، ئنجا ئایا لەسەرمان فەرزە هەمووەمان کل لە چاو بکەین؟ نا، ڕەنگە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ کۆمەڵێك کە چاو ئێشەیان بووە، ئەوەی فەرمووبێ، یاخود وای بەچاك زانیوە، بەڵام وەك ئایین ئێمەی پێوە پابەند نەکردوە.

(ابن القيم) لەوبارەوە وێنەیەك دێنێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمْرَاتٍ مِنْ عَجْوَةٍ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلا سِحْرٌ).[2]

واتە: هەرکەسێك بەیانیان حەوت دەنکە خورمای عەجوە بخوات، ئەو ڕۆژە جادوو و ژەهر کاری تێناکەن.

(ابن القيم) دەڵێ: ئەوە مەرج نیە بۆ هەموو شوێنێك بێ، ڕەنگە تایبەت بێ بەخورمای مەدینەوەو، تایبەت بێ بەخەڵکی مەدینەشەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەندێ لەوشتانەی کە فەرمووە، وەك ئەزموونی خۆی وای فەرمووە، وەك چۆن هی دارخورمایەکان فەرمووی: لێیان گەڕێن، دواییش بەریان نەگرت و فەرمووی: من وەك ڕا و گومانی خۆم وامگوت، نەك وەك وەحی و پەیامی خوا.

شایانی باسیشە (النووي) ئەو فەرموودەیەی کە لە کۆتایی یەکەیدا فەرموویەتی:

(أنتـــم أعـــلم بـــأمـــر دنيـــاكم)[3]

---

(١) رواه الطبراني، وحسنه الألباني في صحيح الجامع: ٤٠٥٥.

(٢) رواه البخاري و مسلم عن عامر بن سعد أبيه (رضي الله عنهما)، و قال غيره (سبع تمرات).

(٣) رواه مسلم: ٢٣٦٤.

لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا هێناوە لە (شرح صحیح مسلم)دا: (باب وجوب امتثال ماقاله شرعاً، دون ماذکره من معایش الدنیا علی سبیل الرأي) واتە: (باسی ئەوە کە پێویستە ئەوەی وەك شەریعەت فەرموویەتی، جێ بەجێ بکرێ، نەك ئەوەی وەك ڕای خۆی لەبارەی کاروباری ژیانی دنیاوە، فەرموویەتی).

٧- لەڕووی سیاسییەوە:

کاتێك پێغەمبەری خوا ویستی صوڵح بکات لەگەڵ هۆزی (غگفان)دا، لەکاتێك دا کە ئابلووقەی مەدینە درابوو، لەلایەن (دە) هەزار (١٠،٠٠٠) لە کافرەکانی مەککەو هۆزی (غطفان)ەوە، پێغەمبەری خواسەرۆك عەشیرەتەکانی غەتەفانی بانگ کردو فەرمووی: دەڵێن چی سێیەکی بەرووبوومی مەدینەتان بدەمێ، بەڵام لەکۆڵمان ببنەوە؟

گوتیان: باشە ڕازین.

دوایی کاتێك (سعد بن عبادة) و (سعد بن معاذ)، واتە: سەرۆك هۆزەکانی (خزرج) و (أوس)ی بانگ کردو ڕاوێژی پێکردن.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا ئەوە شتێکە خوا پێی فەرمووی، یان هەر لەبەر ئێمە دەیکەی؟

فەرمووی: بەڵکو ڕای خۆمەو لەبەر ئێوە دەیکەم، ئەوانیش گوتیان: (والله لا نعطیهم إلا السیف)، واتە: بەخوا بەس شمشێریان دەدەینێ، هەروەها گوتیان: ئەوانە پێش ئەوەی خوای بەرز ئێمە بەڕێز بکات بەهۆی تۆوە، مەگەر بەپارە، یان ئەگەر بەمیوانداریی هاتبن، ئەگەر نا تەماعیان لە میوەی ئێمە نەکردوە، ئێستا دوای ئەوەی خوا بەهۆی تۆوە ئێمەی بەڕێزکردوە، بەبەلاش میوەو بەرووبوومیان بدەینێ؟! پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەکاتێك دا کە ڕێککەوتنەکەیان نوسی بوو و هێنابوویانە سەر ئیمزا کردنیش، فەرمووی: بیدڕێنن، مادام ئێوە ڕازی نین![1]

---

(١) السیرة النبویة لابن هشام، ج٣، ص١٠٨ و ١٠٩، دار ابن الهیثم: ٢٠٠٦م.

٨- لەڕووی دروشمەکانی خواپەرستییەوە:

هەندێك لە ئەهلی عیلم وایانزانیوە کە سوننەتە مینبەر سێ پلە بێ و، دواندەر (خطیب) شمشێر، یان گۆچانی بەدەستەوەبێ، لەکاتی وتاردان دا! کە لەڕاستیی دا ئەوانە هیچیان سوننەت نین و، لە چوارچێوەی عادەت و نەرێتی ئەوسای گەلی عەڕەب دا بوونە.

ئنجا لە هەمووشی سەیر تر ئەوە بووە، کە دوایی باوی شمشێری ڕاستەقینەی ئاسن نەماوەو، چەکی دیکە شوێنی گرتۆتەوە، لە ساڵانی ڕابردوودا - لەسۆنگەی ئەوەوە کە وازانراوە شمشێر بەدەستەوەگرتنی دواندەر (خطیب) سوننەتە - زۆرێك لە مەلا وتاربێژەکان، شمشێرێکی تەختەیان لەکاتی وتاردان دا بەدەستەوە دەگرت!

بەر لە کۆتایی دەڵێم: براو خوشکانی بەڕێز! بەتەئکید ئێمە مسوڵمانەتییەکەمان پەیوەستە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾

آل عمران -٣١ و ٣٢-

خوا بەپێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {پێیان بڵێ: ئەگەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خوا خۆشی دەوێن و، لە گوناهەکانیشتان دەبووڕێ و خوا لێبوردەی بەبەزەییە، بڵێ: فەرمانبەری خواو پێغەمبەری خوابن، ئنجا ئەگەر پشتیان تێکردی، خوا کافرانی خۆشناوێن} بەڵێ، مسوڵمانەتیی ئێمە پەیوەستە بەشوێنکەوتنمان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، شوێنکەوتنی پێغەمبەریش، فەڕزە لە سەر هەموو مسوڵمانێك و، بەبێ ئەوە مرۆڤ نابێتە مسوڵمان، دەبێ ئیمانت وەك ئیمانی وی و، عیبادەت و دینداریيت، وەك هی وی بێ، هەروەها ڕەوشت و ئاکارو هەڵسوکەوتت، وەك هی وی بێ، بەڵێ، شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر هەموو کەس

فەڕزە، بەڵام ئایا چۆن شوێنی پێغەمبەر بکەوین؟سەرەتا دەبێ بێنین: چاك لە کەسایەتیی پێغەمبەری خوا وردبینەوەو، چاك لە ڕێ وشوێنەکەی تێبگەین و، چاك لەسوننەتەکەی تێبگەین و پۆلێنی بکەین و، هەرکام لە بەشەکانی سوننەت لەشوێنی خۆی دادابنێین، ئنجا کە وامان کرد، گرفتی زۆرمان بۆ چارەسەر دەبن و، ئیشکالی زۆرمان لەکۆڵ دەبنەوە.

کۆتایی ئەم بابەتەش بە قوڵە نەزیلەیەک دێنم:

**بەسەرهاتێکی سەیرو جێگای پـەند وەرگرتن:**

ڕۆژێك هەواڵیان دامێ، گوتیان: مامۆستا! فلان تیپەمان لە فلان شوێن، پێشمەرگەکان جاری وایە ڕۆژ هەر بەدەرەوەیە، ڕۆژوو دەشکێنن، گوتم: بۆچی؟ گوتیان: فلان بەرپرسەیان فەتوای بۆداون، منیش بەرپرسەکەیانم بانگ کردوگوتم: کاك فلانکەس! ئەوە چۆنەو ئەو فەتوایەت لە کوێ هێناوە؟ دیارە ئەوان بنکەیان لە شوێنێك بوو ئەملاولای شاخ بوو، لە شوێنی واش ڕۆژ زووتر ئاوا دەبێ،گوتی: مامۆستا! حەدیسێك هەیە دەفەرموێ: بۆ ڕۆژوو شکاندن، بچۆ سەر پشتی حوشترێك، ئەگەر ڕۆژت لێ دیار نەبوو، ڕۆژوو بشکێنە، ئنجا ئێمەش گردێکمان لە تەنیشتێ هەیە، بەقەدەر دوو حوشتران بەرزە، دەچمە سەر گردەکە و ئەگەر ڕۆژ دیار نەبوو، دەڵێم: بیشکێنن، گوتم بۆچی وادەکەی؟ گوتی: بۆ ئەوەی تەتبیقی سوننەت بکەم، منیش گوتم ئنجا کاکە تۆ دەزانی چی بکە؟ گوتی: چی بکەم؟ گوتم: تۆ بچۆ (دەرەی مەڕ) "دەرەی مەڕ گوندێکە لە هەورامان لە شیوێکی قووڵ دایە" گوتم لە (دەرەی مەڕ) هەر لەدوای نیوەڕۆوە ڕۆژ دیارنامێنێ و، ئنجا لەوێ هەر لەدوای نیوەڕۆوە ڕۆژوو بشکێنە!

گوتم: برای بەڕێز! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بۆ دەشت و بیابان فەرمووە، لە بیابان کە قورسی خۆر (قُرْص الشمس) ئاوابوو و ونبوو، یەکسەر شێوان (مغرب)ە، بەڵام ئەوەی بۆ شوێنێکی وەك کوردستان نەفەرمووە، تۆبێنی لە بن شاخێك بی، ئنجا ڕۆژ لە شاخەکە بگیرێ و، ئێستا هەر عەسر

بێ، تۆ ڕۆژوو بە خەڵکی بشکێنی!

گوتم: ئایا هیچ سوننەتێك نەمابوو فێریان بکەی، ئەوە نەبێ ڕۆژوویان پێ بەتاڵ بکەیەوە؟!

بەڵێ لەڕاستییدا تێگەیشتن لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر پێویستە، وەهەر حەدیسێکی پێغەمبەری خوا، دەبێ لەشوێنی خۆیدا بەکاری بێنین، بۆئەوەی ئەو بێسەروبەرییەی کە هەیە، لە نێو مسوڵمانان دا کۆتایی پێ بێنین.

خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی یارمەتیمان بدات زیاتر لە قورئان تێبگەین و، زیاتر لە سوننەتی پێغەمبەری خوا شارەزابین و، باشتر و ژیرانەتر شوێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەوین و، شایستەی ئەوەبین بڵێین: ئێمە شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرەین (صلى الله عليه وسلم).

سبحان ربك رب العزة عما يصفون . وسلام على المرسلين .

والحمد لله رب العالمين.

# دەستپێك

**خوێنەری سەنگین و شیرین!**

ئەم بەشی دووەمەی ئەم کتێبە، وەرگێڕراوی دەقی بەشی سێیەمی کتێبی نۆیەمە لە مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله} بەناوونیشانی: (الإتِّبـــاع لرسول الله (صلى الله عليه وسلم))[1].

شایانی باسیشە ئێمە لە کتێبی ناوبراودا، وەك یەکێك لە پێنج دیو (مظهر) ی هیدایەتدرانی مرۆڤ و، پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، لە خودی خۆیدا (إهتداءُ الإنسان بهدى الله والتزامه بشريعته في خاصَّة نفسه)، باسی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوامان (صلى الله عليه وسلم) کردوە، ئەویش لە شەش باس دا و بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

١- مانای شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و چۆنیەتییەکەی.

٢- حوکم و گرنگیی شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

٣- شوێنکەوتنی پێغەمبەریش، وەك دەست بە کتێبی خواوە گرتن، دوولایەنی تاکیی و کۆمەڵیی هەن.

٤- شوێنکەوتووە ڕاستەکانی پێغەمبەر و میراتگرە کامڵەکانی، ئەوانەن کە بەتەواویی و بەهەموو ڕەهەندەکانییەوە، ڕێبازەکەی بەرجەستە دەکەن.

---

(١) ئەوە لەچاپی دووەم دا، بەڵام لەچاپی یەکەم دا، بریتیە لە: (المبحث الثالث: الإتباع لرسول الله)، بڕوانە: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}، الباب الثالث: الفصل الأول، المبحث الثالث، ص ٧٥-١٠٦.

٥- بەبێ تێگەیشتنی کتێبی خواو، توند دەست پێوەگرتنی، ناگونجێ وەك پێویستە شوێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەوین.

٦- بوارو مەیدانەکانی شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

سەرجەم ئەو شەش باسەش لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە بەپێزانەی قورئانی مەزن و بەڕێزدا دەخەینەڕوو، کەواتە با تێیان ڕامێنین و لێیان وردبینەوە:

١- ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ آل عمران: ٣١ - ٣٢.

٢- ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ٦٤ .

٣- ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴾ النساء: ٨٠.

٤- ﴿ وَٱكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ ۖ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ

ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ الأعراف: ١٥٦ - ١٥٧.

٥- ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴾ الأعراف: ١٥٨.

٦- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةًۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ الأنفال: ٢٤ - ٢٥.

٧- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الأنفال: ٦٤.

٨- ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ التوبة: ١١٧.

٩- ﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ النور: ٥٤.

١٠- ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ النور: ٦٣.

١١- ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الفرقان: ٢٧ - ٢٩.

١٢- ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب: ٢١.

١٣- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الحجرات: ١.

١٤- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات: ٢.

١٥- ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر: ٧.

# باسی یەکەم

## مانای شوێنکەوتنی پێغەمبەر و چۆنیەتییەکەی

شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە شوێنپێ هەڵگرتنی و چاولێکردنی و کردنی بە سەرمەشق و، هەڵس وکەوتکردن بەگوێرەی ڕێبازەکەی، چۆنیەتییەکەشی ئەوەیە کە ڕێبازو ڕێ وشوێنەکەی بکەینە چرایەك و، لەبەر ڕۆشنایی دا وبەپێی وی، هەنگاو بنێین لە هەموو کاروباری ژیانی تایبەتی و گشتی ماندا، یانی بوارەکانی: بووناسیی (معرفه الوجود) و ئیمان و عیبادەت و ڕەوشت و مامەڵە و جەنگ و حوکم و سیاسەت و ...هتد.

ئەویش لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوای بەرز هیچ کام لە پێغەمبەرانی خۆی نەناردووە، هیچ کام لە ڕەوانەکراوانی ڕەوانە نەکردوە، مەگەر بۆئەوەی پەیڕەویی لێبکرێ و، فەرمانبەریی بۆبکرێ و شوێنپێی هەڵبگیرێ، وەك خوای بەرز فەموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴾ النساء: ٦٤ .

حیكمەتی هەرە گەورەی مرۆڤبوونی پێغەمبەرانیش - علیهم السلام- وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ ۗ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ یوسف: ١٠٩

بەڵێ، گەورەترین حیكمەتی تەنیا لە مرۆڤان، بوونی پێغەمبەران و، پیاو (رَجُلْ) بوونیان، ئەوە بووە كە خەڵكی بتوانن بیانكەنە سەرمەشق و شوێنیان بكەون، لەچۆنیەتی گوزەراندنی قۆناغی ژیانی دنیایان دا، بەپێی ڕەزامەندیی خوا تبارك وتعالی، ئەویش بۆئەوەی بەڵگەی خوا لەسەر تێكڕای خەڵكی تەواو ببێ و، هیچ بیانوویان نەبێ بۆ بەندایەتیی نەكردن بۆ خوا و، نەژیان بەپێی بەرنامەی خوا، كە بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارۆژیان بۆ دەستەبەر دەكات، وەك خوای پایەبەرز فەرموویەتی:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ النساء: ١٦٥

ئنجا ئەگەر هاتباو پێغەمبەران و ڕەوانەكراوان (الأنبیاء والرُسُل) - وەك ئەهلی كوفر لەڕووی نەفامیی و سەرخەرییەوە داوایان دەكرد - بۆنموونە: فریشتە بوونایە، ئەوە بەشەر نەیدەتوانی چاویان لێ بكات و بیانكاتە سەرمەشق، ئنجا چۆن خەڵكی فریشتان بكەنە سەرمەشق، لەحاڵێك دا كە ناخۆن و ناخۆنەوە و، ناخەون و، هاوسەرگیریی ناكەن و...هتد؟!

هەر بۆیەش خوا سبحانه وتعالی لەزۆر ئایەتان دا سەرنجی بۆ ئەو ڕاستییە ڕاكێشاوین، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ

﴿فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا﴾ الفرقان: ٢٠

وە فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ﴾ الرعد: ٣٨.

هەڵبەتە پێغەمبەران و ڕەوانەکراوانیش لەڕووی: ڕووح و عەقڵ و جەستە و سۆزەوە، لە هەموو کەس تێرو تەواوتربوون، بەتایبەت کۆتایی پێغەمبەران (محمد) (صلى الله عليه وسلم)، کە خوای کاربەجێ، وەك چرایەکی تیشکدەر بۆ سەرجەم بەشەری ناردوە، هەتا خوا زەمین و هەرچی لەسەریەتی بەمیراتی دەگرێ، کە ڕێبازی ژیانێکی ڕاست و ڕێکیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە مایەی دەستەبەرکردنی ڕەزامەندیی خوایە تبارك وتعالى، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ شَـٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٤٥ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ٤٦ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا﴾ الأحزاب: ٤٥ - ٤٧

دیارە دواتریش لە باسەکانی داهاتوودا، ماناو چۆنیەتی شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوونتر دەبێتەوە، بۆیە لێرەدا بەم ئەندازەیە واز دێنین، ئەگەر نا ئەم بابەتە لایەنی دیکەشی هەن، کە پێویستە ئاماژەیان پێ بکرێ، وەك دوایی دێ.

## باسی دووەم

## حوكم و گرنگیی
## شوێنكەوتنی پێغەمبەر

حوكمی شوێنكەوتنی پێغەمبەری خاتەم -وەك سەرجەم پێغەمبەرانی دیكە- علیه وعلیهم الصلاه والسلام، بریتیە لە پێویستبوون (وجوب)ێك كە بەرانبەرەكەی كوفر و لەئیسلام دەرچوونە، نەك پێویستبوونێك، كە بەرانبەرەكەی پەسندو خۆبەخشیی (النّدب والتّطوع)یە، زۆرێك لەو ئایەتانەش كە لەسەرەتای ئەم بەشەوە هێنامانن، بەڕوونترین شێوە ئەو مەبەستە دەگەیەنن، با سەرنجیان بدەین:

**یەكەم:** هەرچی ئایەتی (٣١)ە، لە (آل عمران) :

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾

خوای بەرز سبحانه وتعالی تێیدا شوێنكەوتنی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) كردۆتە بەڵگەی سەلماندنی بوونی خۆشەویستی خوا لەدڵی بەندەدا، سەربارەش كردوویەتە هۆكاری خۆشویستنی خوا بۆ بەندەو لێبوردنی خۆی!

كەواتە: هەركەس شوێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەكەوێ، لەدەعوای خۆشویستنی خوای بەرزدا، بەڕاست دانانرێ، هەر كەسێكیش وابێ، هۆكارێك نیە كە خۆشویستن و لێبوردنی خوای بۆ دەستەبەر بكات، ئاشكراشە جێگرەوە (بدیل)ی خۆشویستنی خوا، جگە لە تووڕەبوونی و، جێگرەوەی لێبوردنیشی، جگە لە سزادانی، هیچی دیكە نیە!

**دووەم:** بەڵام ئایەتی (٣٢) لە (آل عمران) :

﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾

خوای بەرز بەڕوونیی تێیدا ڕایدەگەیەنێ، کە هەر کەس پشت لە فەرمانبەریی پێغەمبەر بکات - کە بەشی سەرەکیی شوێنکەوتنیەتی - ئەوە دەچێتە ڕیزی کافرانێکەوە کە خوا خۆشیناوێن.

**سێیەم:** هەردووك ئایەتی (١٥٦ و ١٥٧)ی (الأعراف)یش، خوای بەرزو مەزن تێیان دا ڕایدەگەیەنێ کە بەزەیی خۆی تایبەت دەکات بە پارێزکارانی زەکاتدەری بڕوادار بە ئایەتەکانی و، شوێنکەوتووی ڕەوانەکراوی نەخوێندەوار:

﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾

کەواتە: هەر کەس شوێنکەوتووی پێغەمبەری نەخوێندەوار نەبێ، ئەوە بێبەشە لە بەزەیی فراوانی خوا، کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

**چوارەم:** ئایەتی (١٥٨)ی (الأعراف)یش:

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾

ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەس شوێنی پێغەمبەری نەخوێندەوار نەکەوێ، ئەوە لەڕێنمایی خوا بێبەشەو، بێگومان جێگرەوەی ڕێنمایی خواش تەنیا گومڕایی یە.

**پێنجەم:** ئایەتەکانی (٢٤ و ٢٥)ی (الأنفال)یش، خوا سبحانە وتعالی تێیان دا ڕایگەیاندوە:

کە وەڵامدانەوەی خواو پێغەمبەرەکەی هۆکاری ژیانە بۆ ئەهلی ئیمانو، پێچەوانەکەی مایەی ئاشووب و بەڵایەکی گشتییە، کە هەموو لایەك دەگرێتەوەو تەنیا لەسەر ستەمکاران کورت هەڵنایەت.

**شەشەم:** لە ئایەتی (٦٣)ی (النور)دا، خوای باڵادەست بە دوو شتان هەڕەشە لە سەرپێچییکارانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات:

١- ئاشووب و بەڵا (لە دنیادا).

٢- ئازاری بەئێش (لە ڕۆژی دوایی دا).

لە سیاقەکەشی دەفامرێتەوە، کە مەبەست لە (فتنة) لێرەدا: کوفرو هەڵگەڕانەوەیە، یان مەبەست پێی دەستەڵاتڕانانی کافرانە بەسەر مسوڵمانان دا، پێدەچێ ئەم مانایەی دووەم بۆ وشەی (فتنة) لێرەدا لە هی یەکەم بەهێزتربێ، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەستەڵاتڕانانی کافران بەسەر مسوڵمانان دا، لە ئەنجامی لادانیان لە ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەگەڵ سزاو ئازاری بەئێشی دوارۆژدا، بەراوردکراوەو، هەردووکیشیان هەر ئازارن، یەکیان لێرەو ئەوی دیکەیان لەولا!

**حەوتەم:** هەروەها بەڵگەیەكی دیكە لەسەر حوكم و گرنگیی شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و مەترسیی پشت تێكردنی، ئایەتەكانی (٢٧ و ٢٨ و ٢٩)ی (الفرقان)ن، چونكە خوای زاڵ تێیان دا ڕوونی دەكاتەوە:

كە بابای لادەر لە ڕێبازی پێغەمبەر و، جگە لەو - مەبەست ناحەزانیەتی- بەدۆستگر، چۆن لە ڕۆژی قیامەت دا لە پەشێمانییان و لە خەفەتان، هەردووك دەستی دەگەزێ، بەڵام كاتی پەشێمانیی بەسەرچووە!

**هەشتەم:** لەئایەتی (٢١)ی (الأحزاب):

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾

بەڕوونیی دەفامرێتەوە، كە هەر كەسێك بەهیوای بەزەیی و چاكەی خوابێ و، بە ئومێدی دەربازبوونی ڕۆژی دوایی بێ و، زۆر یادی خوا بكات، ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باشترین پێشەنگ و سەرمەشقیەتی، كەواتە: هەر كەسێك پێغەمبەر نەكاتە سەرمەشقی خۆی، ئەوە لە ڕیزی وەسفكراوان بەو سێ سیفەتانەدا نیە!

**نۆیەم:** هەروەها ئایەتی (١)ی (الحجرات)یش، ئەوە دەگەیەنێ:

كە هەر كەس لەپشت پێغەمبەری خواوە نەڕوات و شوێنپێی هەڵنەگرێ، بەڵكو وەپێشی بكەوێ و ڕای خۆی پێش ئاڕاستەكانی بخات، ئەوە لەوانەیە كە پارێزیان لەخوا نەكردوە!

**دەیەم:** ئایەتی (٢)ی (الحجرات)یش ئەوە دەگەیەنێ:

كە كەمترین بێڕێزیی نواندن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - وەك دەنگ بەسەر دەنگی دا بەرزكردنەوەی- كردەوەی چاكی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە، چ جای ڕەتكردنەوەی فەرمانی و ڕەفزكردنی ڕێبازو بەرنامەكەی، كە گەورەترین بێڕێزیی یە بەرانبەری!!

**یازدەیەم:** لەکۆتایی دا: ئایەتی (٧)ی (الحشر)یش ئەوە دەگەیەنێ:

کە هەرکەس ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەگرێتەبەر، بەفەرمان و قەدەغەکانییەوە، ئەوە پارێزکاریی لەخزمەت خوادا نەکردوە، دووچاری سزای سەختی خوای دادگەر دەبێت.

دیارە هەرکام لەو ئایەتانەی ڕابردن بەتەنیاو لەخودی خۆیان دا - چ هەموویان وێکڕا- بەڵگەیەکی ئاشکرایە، لەسەر پێویستبوونی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەوپەڕی گرنگ بوونی، هەروەها لەسەر ئەوە کە بەڕەهایی[1] شوێن نەکەوتنی پێغەمبەری خوا، بەڵگەیەکی ڕاشکاوە، لەسەر بێبڕوایی خاوەنەکەی و لەبەندایەتیی دا بۆ خوا ڕاست نەکردنی، وەك کاتی خۆی شاعیرێك گوتوویەتی:

تعصى الإلـه وأنت تزعـم حُـبَّهُ      لَعَمْرك هـذا في المقـال بديـع
لو كان حـبك صـادقاً لأطَـعْـتَـهُ      فـإن المُحــبَّ لمن يحبُّ مُطيـع

واتە: سەرپێچیی خوا دەکەی و، پێت وایە خۆشیشت دەوێ! بێگومان ئەوە قسەیەکی سەیرە!

ئەگەر خۆشویستنەکەت ڕاست بووایە، فەرمانبەرییت دەکرد، چونکە کەسێك کەسێکی خۆشبوێ، بەقسەی دەکات.

---

(١) بۆیە وشەی: شوێن نەکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (عدم اتباع رسول الله)مان بەبەندی بەڕەهایی (بإطلاق) بەنددار کردوە، چونکە شوێننەکەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەشتێکی دیارییکراو - یان چەند شتێك دا - بەکوفر دانانرێ، مەگەر ئەو شوێننەکەوتنە، ڕەفزکردن و نکوولییکردنی ڕەگەڵ کەوتبێ.

# باسی سێیەم

## شوێنکەوتنی پێغەمبەریش وەك دەستپێوەگرتنی کتێبی خوا (الإستمساك بكتاب الله) دوو لایەنی: تاکیی و کۆمەڵیی هەن

بەڵێ وەك چۆن شوێنکەوتنی کتێبی خواو، دەستپێوەگرتنی بەرپرسیارێتییەکی تاکیی و کۆمەڵییە، لەیەك کات دا، بەهەمان شێوەش شوێنکەوتنی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەرپرسیارێتییەکی دوولایەنەیەو، لەیەك کات دا ڕوو لەهەرکام لە تاك و کۆمەڵ دەکات، چونکە هەندێك لایەن لەڕێبازی پێغەمبەردا هەن، مرۆڤ دەتوانێ لەخودی خۆیداو بەتایبەت پێیانەوە پابەندبێ، ئەویش وەك: ئیمان و، خواپەرستیی کەسیی - بەمانا تایبەتییەکەی - و، تەزکیەی نەفس و، ڕەوشتی پەسند.

بەڵام زۆر لایەنیشی هەن، کە مەگەر بەهەرەوەزیی و بەکۆمەڵ، ئەگەرنا ناکرێ جێ بەجێ بکرێن و، پابەندیی یان پێوەبکرێ، ئەویش وەك: جێ بەجێ کردنی دروشمە کۆمەڵییەکان، لە نوێژی بەکۆمەڵ و، حەج وعومرەو، جومعەو نوێژەکانی: دوو جەژنەکان و، خۆرو مانگ گیران و، داوای باران بارین کردن، هەروەها بانگەوازو فێرکردن و، فەرمان بەپەسند و ڕێگریی لە ناپەسند و، بەرپاکردنی سنوورو سزایەکان و، هێنانەدی دادگەریی و، جەنگ وجیهادو.. هتد.

ئنجا هەر ئەمەش نهێنیی، زۆریی فەرمان كردنە بەشوێنكەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە قورئانیَ دا بەڕێژگەی كۆ (صيغة الجمع)، چونكە شوێنكەوتنی ڕێبازو ڕیَ وشوێنی پێغەمبەر بەتەواویی، تەنیا كاتێك مەیسەر دەبیَ، كە مسوڵمانان كۆبن و، كاروباریان ڕێك وپێك بیَ، لەوبارەوەش بەهێنانەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە وازدێنین:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الأعراف: ١٥٧

چونكە لەم ئایەتە بەپێزەدا، خوای كاربەجیَ تبارك وتعالى پێغەمبەری پەیڕەویی لێكراو (الرسول المتبوع) و پەیڕەوانی بڕواداری (أَتباعَهُ المؤمنين) بەكۆمەڵێك وەسف پێناسە دەكات كە خوازیاری كۆبوونەوەی مسوڵمانانن، بۆ شوێنكەوتنی پێغەمبەرو گرتنی ڕێبازەكەی، هەركات بیانەویَ بەڕاستیی ڕێبازەكەی بگرن، كە بەبیَ ئەوە لەڕیزی بڕواداران دا ناژمێررێن.

**وەسفەكانی پێغەمبەریش** (صلى الله عليه وسلم)**ئەم شەشەن:**

١- فەرمانیان پێدەكات، بەهەرچی پەسندە ﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾.

٢- ڕێگریی یان لێدەكات، لەهەرچی ناپەسندە ﴿وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾.

٣- هەرچی خۆش وسوودبەخشە، بۆیان حەڵاڵ دەكات ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾.

٤- هەرچی پیس وزیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەكات ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾.

٥- كۆڵی قورسی سەرپشتیان لادەبات ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ﴾.[1]

---

(١) الإصر: العَهْد، وهو أيضاً: الذنب والثِّقل، مختار الصحاح، ص٢٩.

٦- هەروەها کۆت و پێوەندەکانیان دەپسێنێ ﴿وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ﴾.

ئاشکراشە کە هەڵسانی پێغەمبەری بەڕێز بەو شەش کردەوەیەو، لەخۆدا هێنانەدی ئەو شەش سیفەتە، بوونی کۆمەڵێکی بڕوادار، یان کۆمەڵگایەکی بڕوادار، پێویست دەکات، ئەگەرنا: ئایا فەرمان بە کێ دەکات و، ڕێگریی لە کێ دەکات؟ ئایا بۆ کێ حەڵاڵ دەکات و، لە کێ قەدەغە دەکات؟ ئایا کۆڵی قورسی سەرپشتی کێ لادەبات و، کۆت و پێوەندەکانی دەست و پێ وگەردنی کێ دەپسێنێ؟

**بەڵام وەسفەکانی شوێنکەوتووانی بڕواداری پێغەمبەر** (صلی الله علیه وسلم)، **ئەم چوارەن:**

١- بڕوایان پێ هێناوە ﴿ءَامَنُواْ بِهِۦ﴾.

٢- ڕێزیان گرتوەو بەمەزنیان گرتوە ﴿وَعَزَّرُوهُ﴾.[1]

٣- پشتگیرییان کردوە ﴿وَنَصَرُوهُ﴾.

٤- شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کەبۆی دابەزێنراوە ﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾.

ئنجا هەرچەندە مرۆڤ دەتوانێ وەك تاکێك بڕوا بەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بێنێ، بەڵام مەحاڵە بتوانێ بەتەنیا ڕێزلێگرتن و بەمەزنگرتن و پشتگیریی کردنی - کە مەبەست پێی بەهێزکردنی ڕێبازەکەی و سەرخستنی و چەسپاندنیەتی لەسەر ئەرزی واقیع - ئەنجام بدات، هەروەها ناگونجێ مرۆڤ بەتەنیا شوێن ئەو ڕوناکییە بکەوێ، کە لەگەڵی دابەزێنراوە -کە کتێبی خوایە- بەڵکو پێویستە ئەو ئەرکە گەورە و گرنگانە، بە هەرەوەزیی و کاری بەکۆمەڵ جێ بەجێ بکرێن.

---

(١) التعزير: التوقير والتعليم، وهو أيضاً: التأديب ومنه التعزير الذي هو الضَّرْبُ دون الحَدِّ، مختار الصحاح، ص٣٧٨.

## باسی چوارەم

### شوێنکەوتووە ڕاستەکانی پێغەمبەرو میراتگرە تەواوەکانی، ئەوانەن کە ڕێبازەکەی بەتەواویی و، بەهەموو لایەنەکانیەوە جێ بەجێ دەکەن

بەڵێ مرۆڤ لەڕیزی شوێنکەوتووە ڕاستەکانی پێغەمبەر و، پەیڕەوانی ڕەسەنی ڕێبازەکەیدا دانانرێ، تاکو لەهەموو شتێك دا شوێنی نەکەوێ و لەوردو درشت دا پەیڕەویی لێ ناکات، ئەمەش لەسەرمان پێویست دەکات، کە پێناسەی ڕێبازی پێغەمبەر (السنَّة النبوية) بکەین و چەمکەکەی ڕوون بکەینەوە، بۆیە بەکورتیی دەڵێین:

**زانایان بەمجۆرە پێناسەی (السنَّة)یان کردوە:**

{السنة في اللغة تعني السيرة والطريقة المتبعة[1]، وفي الإصطلاح الشرعي: هي أقوال النبي (صلى الله عليه وسلم) وأفعاله وتقريراته[2]}.

واتە: (سنة) لە زمان دا یانی: ڕێ وشوێن و ڕێبازێکی پەیڕەویی لێکراو، لە زاراوەی شەرع دا: سوننەت بریتیە لە فەرموودەو کردەوەو دانپێدا هێنانەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

---

(١) مختار الصحاح، ص٢٨٤، لفظ: س ن ن..

(٢) التعريفات للجرجاني، ص١٢٤.

**منیش بەم شێوەیە پێناسەی ڕێبازی پێغەمبەر دەکەم:**
**(بریتیە لەو ڕێبازو چۆنیەتییەی کە پێغەمبەری بەڕێز، دینداریی وبەندایەتیی خوای بەرزی پێکردوە، بەشوێنکەوتنی ئایینەکەی و، جێ بەجێ کردنی بەرنامەکەی، کە لە قورئان دا بەرجەستەیە، چ لە ژیانی تایبەتیی خۆی دا، یان خێزانیی، یان کۆمەڵی بڕوادار، یان ئەو کۆمەڵگا مسوڵمانەدا، کە مشووری لێ خواردوون.)**
من پێم وایە کە وشەی (سنة) چەمك و واتایەکەی نەك هەر لەو واتاو چەمکە جوزئییە فراوانترە، کە شەرعزانان (فقهاء)، یان هەندێکیان بۆیان بەکارهێناوە، بگرە لەو چەمك وپێناسەیەش فراوانترە، کە زانایانی سوننەتیش بەکاریان هێناوە، کە ئەمەش کورتەیەکە حەوجێی بەڕوونکردنەوە هەیە:

شتێکی زانراوە کە شەرعزانان، یان زۆربەیان وشەی (سنة)یان بەبەشێك لە چەمك و واتایەکەی بەکارهێناوە، کە بریتیە لەوەی لەبەرانبەر پێویست (واجب و فرض)دایە و، بە پەسندو زیادەو خۆبەخش (ندب و نفل و تطوع) دەناسرێ، بۆوێنە: دەگوترێ: (دوو ڕکات نوێژی سڵاوی مزگەوت سوننەتە).

هەڵبەتە سوننەت بەم چەمکە، ئەوەیە کە: مرۆڤ بەکردنی پاداشتی دەبێ، بەڵام بە نەکردنی سزابار نابێ: (مايُؤْجَر الإنسان على فعله، ولايُعاقَب على تركه)، بەپێچەوانەی پێویست (واجب و فرض)ەوە، کە لەسەرکردنی پاداشت دەدرێتەوەو، لەسەر چواندنیشی سزادەدرێ، وەك پێنج نوێژە فەرزەکان.

دیارە ئەم چەمکەش بۆ وشەی (سنة) پڕ بەپێستی مانای ڕاستەقینەی نیە، بەڵکو مانایەکی زاراوەیی یە، کە شەرعزانان لەسەری پێکهاتوون[١].

شارەزایانی سوننەت و فەرموودەش - وەك پێشتر گوتمان - وشەی (سنة) یان بەوە پێناسە کردوە کە بریتیە لە: فەرموودە و، کردەوە و، دان پێداهێنانەکانی پێغەمبەر، (أقوال النبي وأفعالُه وتقريراته) یانی: ئەو فەرمایشتانەی فەرمووني و، ئەو کردەوانەی کردووني و، ئەوەی کە لە لای گوتراوە، یان کراوە، ئەویش

---

(١) معجم المصطلحات و الألفاظ الفقهية، د. محمود عبدالرحمن عبدالمنعم، ج٢، ص ٢٩٨-٢٩٩.

دانی پێداهێناوەو بەڕاستی داناوە.

هەڵبەتە ئەم پێناسەیەش فراوان و گشتگیرەو، هیچ شتێك لەڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نابوێرێ، بەڵام بۆیە گوتمان: ئەم پێناسەیەش لەچەمك و واتای ڕاستەقینەی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەسكترە، چونكە:

پسپۆرانی فەرموودەو شوێنەوار (أهل الحديث و الأثر) كتێبی خوا (كتاب الله)، لە چەمكی سوننەت هەڵداوێرن و، وشەی (سنة) لەبەرانبەر (قرآن)دا دادەنێن و، مەبەستیشیان لە نێوەڕۆكی (سنة) هەرچییەكە كە لە پێغەمبەری نەخوێندەوار صەڵات و سەلامی خوای لێ بێ، دەرچووە لە فەرموودەو كردەوەو دانپێداهێنانەكان، جگە لە قورئان.

من ڕام وایە -هەر خواش زانای كاربەجێیە- كە ئەوە بەرتەسككردنەوەی چەمكی فراوان و گشتگیری سوننەت و سنووردار كردنیەتی، چونكە كتێبی خوا، نەك هەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ڕێبازەكەی، جیاو هەڵاوێردراو نیە، بگرە قورئان، بناغەو هەناوو بڕبڕەی پشتی ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، چونكە:

**یەكەم:** كتێبی بەپێزی خوا جەوهەرو بناغەی فەرمایشتەكانی پێغەمبەرو كردەوەكانیەتی:

أ- چ بەهۆی خوێندنەوەی ڕاستەوخۆیەوە بۆ كتێبی خوا، لەنوێژەكان و وتارەكانی و غەیری وانیش دا، كە ئەویش ئەركی سەرەكیی بووە، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

١- ﴿...يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ﴾ آل عمران: ١٦٤.

٢- ﴿ ... يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ البقرة: ١٢٩.

٣- ﴿ ... يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٥١.

٤- ﴿ ... لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَـٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴾ الرعد: ٣٠.

هەروەها کە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم: ٣ - ٤

هەر مەبەست پێی خوێندنەوەی قورئان بووە.

**ب- چ بەهۆی ئیلهام وەرگرتنی و هەڵهێنجانییەوە، لە کتێبی خوا.**

**دووەم:** هەروەها کتێبی خوا هەوێنی سەرجەم هەڵس و کەوت و ئاکارەکانی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) :

وەك دایکی بڕواداران عائیشە (الصِّدِّيقة بنت الصديق) خوا لێیان ڕازی بێ بەجوانترین شێوە ئەو ڕاستییەی دەربڕیوە، کە لە وەڵامی کەسێك دا کەلەبارەی ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەرە، پرسیاری لێکردوە، گوتوویەتی:

**(كان خُلُــق نبــي اللّٰه القــرآن)** رواه مسلم: ٧٤٦.

واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا، قورئان بوو.

کەواتە: کتێبی خوای بەرز، بناغەو هەناوی سوننەتی پێغەمبەری خواو، ئەو ڕووحەیە کە تێیدا دێ و دەچێ، هەر بۆیەش - بەڕای من - هەڵەیە کە

سوننەتی پێغەمبەر لەبەرانبەر کتێبی خوای بەرزدا دابنێین، وەك دوو شتی جیاواز بن و، دوو تای تەرازوویەك بن!

لە حاڵێك دا کە سوننەت، کتێبی خوا لەخۆی دەگرێ و، قورئان ڕووح و کاکڵەو بناغەی ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، ڕێبازی پێغەمبەر، جگە لە چۆنیەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا بۆ کتێبی بەپێزی خواو، ئەو ڕێبازو شێوازەی کە کتێبی خوای مەزنی پێ جێ بەجێ کردوە، شتێکی دیکە نیە.

ئنجا لەبەر تیشکی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێین:

بێگومان تەنیا کەسێك بە پەیڕەوێکی ڕاستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و شوێنکەوتوویێکی تێرو تەواوی ڕێبازەکەی دادەنرێ، کە لەهەموو بوارو لایەنەکانی دینداریی و خواپەرستیی دا، شوێن پێغەمبەری خوا دەکەوێ، لەڕووی:

بووناسیی (المعرفة) و ئیمان و، خواپەرستیی و، تەزکیە و، ڕەوشت و هەڵسوکەوت و، ئەدەبەکان و، جەنگ و جیهاد و، حوکم و سیاسەت و....هتدەوە.

هەروەها ڕێبازو ڕێ وشوێنەکەی سەرلەبەری دەگرێ و، هیچی لێ نابوێرێ و، هیچیشی ناخاتەسەرێ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاکترین و پەسندترین سەرمەشق و پێشڕەومانە و، چاکترین کەسە کە شوێن کتێبی خوا کەوتوە و، بەرنامەی خوای لە ژیانی پڕپیت وپێزیدا بەرجەستەکردوە، وەك خوای کاربەجێ فەرمانی پێکردوەو بۆی دیاریی کردوە، بەفەرموودەی:

﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾ هود: ١١٢

وە بەفەرموودەی:

﴿ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ الأنعام: ١٠٦

ئنجا هەر کەسێك ئاینی خوا بەتەواویی لەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

بەمیرات بگرێ و، بەتەواویی پارێزگاریی لە ڕێباز و ڕێ و شوێنەکەی بکات و، هەوڵبدات بۆ پێوە پابەندبوونی لەبازنەی خودی خۆی و، بازنەی خێزانی و، بازنەی کۆمەڵگاکەی و، تێکڕای مرۆڤایەتیی دا، وەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکانی کردوویانە و، پێشەوا سەر ڕاستەکان و زانا ڕەسەنەکان و صاڵحانی شوێنکەوتووشیان، بەپێی ڕێبازی وان ڕۆیشتوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە، بە ئەندازەی ئەوە کە شارەزایی و ئیخلاص و تێکۆشانی لەلایە، بەشوێنکەوتووی ڕاستی پێغەمبەر و میراتگری تەواوی دادەنرێ.

بەڵام بێگومان سەرگەرمبوون بەلایەنێك، یان زیاتری ڕێبازی پێغەمبەرەوە، وەك عادەتی زۆر دەستە و تاقمی مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا، لە ڕووی عەقیدە، یان تەزکیەی نەفس، یان دەستگرتن بە هەندێك شتی ڕواڵەتییەوە، وەك: ڕیش هێشتنەوە و، پۆشاك هەڵپێچان و، سیواك کردن و، پێچە گرتنەوە (الإنتقاب) و... هتد، ئەوە ئەمجۆرە ڕەفتار و مەشرەبانە و هاووێنەکانیان، بە شوێنکەوتنێکی جوزئیی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دادەنرێن، چونکە ڕێبازی پێغەمبەر، ئەو شتانەو، گەلێك شتی دیکەی گەورەتر و گرنگتریش دەگرێتەوە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیشم ئەوە نیە کە لە گرنگیی ئەو سەرگەرمییە جوزئییانە، بەهەندێك لەلایەنەکانی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەم بکەمەوە، چونکە هەموو شتێکی ڕێبازی پێغەمبەری خوا گرنگ و بایەخدارە، هەرشتە لە شوێنی خۆیدا و، بەئەندازەی خۆی، بەڵکو ئەوەی مەبەستمە ئەوەیە:

شوێنپێ هەڵگرتنی تێرو تەواوی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و گرتنی ڕێبازەکەی، ئەوەیە کە هەمان شت کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردوویەتی، بیکەین -بەگوێرەی توانا- و، گرنگیی بەتێکڕای ڕێبازی پێغەمبەر بدەین و بەهەموو بەشەکانی، هەرشتە بەگوێرەی پلەکەی و پێگەکەی، بەگوێرەی تەرازووی کتێبی خوا، کە هەندێك شتی، لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی، لە قەبارەی خۆی گەورەتر نەکەین.

ئەویش لەبەرئەوە کە دابەشکردنی ئایین بۆ چەند بەش و لایەنێکی لەیەك دابڕاو، پاشان بەشکردنی ئەو بەش و لایەنانە، بەسەر چەند تاقم و کۆمەڵێك داو، دەستگرتنی هەرکام لەوانە بەوەوە، کە بەمیراتی گرتوەو، دەمارگیربوونی بۆی و، تێدا چڕکردنەوەو کورت هەڵێنانی چەمکی ئایین و، دانپێدانەهێنانی ئەوەی کە لەلای غەیری خۆیەتی، بەڵێ ئائەوە: بناغەی پەرتەوازەیی و دابڕدابڕبوونە، لەڕیزەکانی ئەهلی ئایین دا، لەڕابردوو و ئێستادا، وەك خوای بەرز لەبارەی نەصرانییەکان و هۆکاری پەرتەوازە بوونیانەوە، فەرموویەتی:

١- ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾ المائدة: ١٤.

٢- هەروەها هەر لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ الأنعام: ١٥٩.

٣- هەروەها فەرموویەتی:

﴿ مُنِيبِينَ إِلَيۡهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (٣١) مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ (٣٢) ﴾

الروم: ٣١ - ٣٢.

ئنجا ئەگەر بەش بەشکردنی ئایین بۆ چەند بەشێکی پەرژوبڵاو، پاشان سەرگەرم بوونی هەر کۆمەڵێك لە ئەهلی ئایین بە بەشێکییەوە، بناغەی پەرتەوازەیی و دابڕان بێ، ئەوە بێگومان وەرگرتنی بەتەواویی و گرتنی ڕاستە شەقامەکەی، بەهۆی شوێنکەوتنی ڕێبازی ڕاستی پێغەمبەرەوە، بناغەی پتەوی یەکڕیزیی و تەبایی و برایەتییە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

١- ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ آل عمران: ١٠٣.

٢- ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ الأنفال: ٤٦.

٣- ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ الأنعام: ١٥٣.

خوا پشتیوان بێ لە دوو باسی پێنجەم و شەشەمی داهاتووش دا، تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم بابەتە.

# باسی پێنجەم

## بەبێ تێگەیشتنی کتێبی خواو دەستپێوەگرتنی، ناگونجێ وەك پێویست شوێنی پێغەمبەر بکەوین

بەڵێ بەبێ دەست بەکتێبی خواوە گرتن، بەتێگەیشتن وشوێنکەوتنەوە، ناتوانین بەشێوەیەکی ڕاست ویستراو، شوێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەوین، ئەویش بەلای کەمەوە لەبەر دوو هۆکاران:

**یەك:** وەك پێشتر باسمان کرد و چەندان جار جەختمان لەسەر کردەوە: کتێبی خوا بناغەی ڕێبازو ڕێ وشوێنی پێغەمبەرە، بەڵکو قورئان ئەو بەرنامەیە، کە ئەو فەرمانی پێکراوە شوێنی بکەوێ و، ئەو پەیڕەوەیە کە لەسەر خۆی و ئۆممەتەکەی پێویست کراوە، پێیەوە پابەندبن، پێشتریش بەچەندان ئایەتی بەپێزی قورئان ئەم ڕاستییەمان سەلماندو، لێرە دووبارەیان ناکەینەوەو، بەم ئایەتە بەپێزە وازدێنین:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى

مَآ ءَاتَىٰكُمْ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ المائدة: ٤٨.

چونکە لەم ئایەتە بەپێزەدا، کە لە سیاقێك دا هاتوە، دەربارەی هەرکام لە تەوڕات و ئنجیل دەدوێ، کە یەکەمیان بە موساو، دووەمیان بە عیسا درابوون، سەلامی خوایان لەسەربێ، خوا سبحانە وتعالی شەش ڕاستیی گرنگ دەخاتەڕوو:

١- کە خوا قوڕئانی بەحەق ناردۆتە خوار، یانی: حەقی گرتۆتە خۆی و حەق دەچەسپێنێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾.

٢- کە قوڕئان سەرجەم کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ، واتە: ئەوە بەڕاست دادەنێ، کە لەخوای بەرزەوە هاتوون، نەك نێوەڕۆکی ئێستایان بەڕاست دابنێ، چونکە بێگومان دەستی لادان وگۆڕین ڕۆڵی زۆری تێدا گێڕاون، وێڕای لەبیرچوونەوە: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾.

٣- کە قوڕئانی مەزن بەسەرڕاگەیشتوو وچاودێرە، بەسەر کتێبە پێشووەکانەوەو دادوەرە بەسەریانەوە: ﴿ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾.

٤- کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وئوممەتەکەی لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوە، فەرمانیان پێکراوە حوکمی بەکتێبی خوا بکەن و، بەسەر خەڵکدا جێ بەجێ ی بکەن: ﴿ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾.

٥- کە نە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ونەغەیری ویش بەهیچ شێوەیەك بۆیان نیە لە حوکمی بەرجەستەی خوا لە کتێبەکەی دا، لابدەن و، شوێن ئارەزووی خەڵك و ویستەکانیان بکەون: ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾.

٦- پاشان خوای پاك و تاك ڕوونی دەکاتەوە، کە بۆهەر کام لە ئوممەتان بەگشتی و بەتایبەت بۆ هەر کام لە: ئوممەتی جولەکەو، ئوممەتی نەصڕانیی و،

ئۆممەتی ئیسلام، بەرنامەو پەیڕەوێکی تایبەتی داناوە: ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوای زاناو شارەزا لەم ئایەتە بەپێزەو ئایەتە پێشووەکانی دا (٤٣- ٤٧) جگە لە تەوراتو ئینجیل وقورئان (الکتاب) باسی هیچ کتێبێکی دیکەی نەکردوە، کەواتە: ئەو سێ کتێبە ئەو بەرنامەو پەیڕەوانەن، کە خوای بەرز بۆ سێ ئۆممەتەکەی داناون، ئنجا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد:

کتێبی بەرزو بەپێزی خوا (قرآن) ئەو بەرنامەو پەیڕەوەیە کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی (محمد) و ئۆممەتەکەی دانراوە، هەروەها هەر ئەویش ئەو ڕێبازەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرمانمان پێکراوە، شوێنی بکەوین.

**دوو:** ئاشکرایە کە بەبێ ناسین وئاشنابوون بەکەسایەتیی کەسێك، ناتوانین شوێنی بکەوین و بیکەینە سەرمەشق، ئنجا کتێبی بەهێزو پێزی خواشە کە کەسایەتیی پێغەمبەری خوا (محمد) کۆتایی پێغەمبەرانمان پێدەناسێنێ، بەڵکو زیاد لەوەش: کتێبی مەزنی خوا، بەڵگەی هەرە گەورەو موعجیزەی هەرە مەزنە، کە دەیکەینە بناغەی بڕوا هێنانمان بەپێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری کۆتایی (علیه الصلاة والسلام).

پێویستیشە بگوترێ: کە ئێمە بەبێ پشتبەستن بەکتێبی قسە لەجێی خوا، بۆ ناسینی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گیرۆدەی تێپەڕاندن وبەزایەدان دەبین، چ لەبواری تێڕوانینی و، چ لەبواری مامەڵە لەگەڵداکردنی دا، هەروەك ئەوە حاڵ و واقیعی ئێستای ئەو کۆمەڵ و تاقمانەیە، کە لەو بوارەدا پشتیان بەکتێبی خوا نەبەستوە.

ئنجا با بۆ درەوشاندنەوەی ئەم بابەتە گرنگە - کە بەبێ شارەزایی لە قورئان دا و لە ئاوێنەی ویدانەبێ، ناتوانین وەك پێویست بە کەسایەتیی و تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری خوا ئاشنابین- با سەرنجی دوو کۆمەڵە ئایەت بدەین، کە لەکۆمەڵی یەکەمیان دا: خوای بەرز لایەنێك لەکەسایەتیی پێغەمبەری خاتەم دەخاتەڕوو،

کە وەك مرۆڤێك دەیناسێنێ، کە وەك خەڵکی دیکە هیچ شتێکی بۆخۆی و غەیری بەدەست نیە، بەڵکو بەندەیەکە بەفەرمانی پەروەردگاری هەڵس وکەوت دەکات و دەجووڵێ و، بەپێی ئاڕاستەکان (توجیهات) وەحی بەڕێوەدەچێ و، وەك بۆی دیاریی کراوە، ڕەفتاردەکات.

لە کۆمەڵی دووەمیان دا: خوای کاربەجێ لایەنەکەی دیکە لە کەسایەتیی پێغەمبەری خاتەم دەخاتەڕوو، لەمیانەی ئەو پلەو پایەو تایبەتمەندییانەدا کە پێی بەخشیون، کە کردوویانە بە چاکترین مرۆڤ و سەروەری پێغەمبەران و، بەڕێزترین کەس لەلای خواو، خۆشەویستترینیان لەلای، دەیناسێنێ:

**کۆمەڵی یەکەم:**

١- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾

الشورى: ٥٢.

٢- ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾ القصص: ٨٦.

٣- ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾

الأعراف: ١٨٨.

٤- ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾

الأحقاف: ٩.

٥- ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ﴾ آل عمران: ١٢٨.

٦- ﴿ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾ الأنعام: ٣٥.

٧- ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴾ الكهف: ١١٠.

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴾ فصلت: ٦.

کۆمەڵی دووەم:

١- ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧.

٢- ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١٢٨.

٣- ﴿ وَالضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ الضحى: ١ - ٥.

٤- ﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ۚ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦.

٥- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ الحجرات: ٢.

٦- ﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ١ - ٤.

٧- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾

الأحزاب: ٤٥ - ٤٧.

ئنجا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد و لەبەر تیشکی ئەو دوو کۆمەڵە ئایەتەدا دەڵێین: کەسایەتیی ڕاستەقینەی ڕەوانەکراوی هەرە مەزنی خواو، پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلی الله علیه وسلم)، ئەوەیە کە ئەم ئایەتە بەپێزانە، بەهەردووك کۆمەڵەکەوە، دەیخەنەڕوو، ئاشکراشە کە تەنیا پەروەردگاری پێغەمبەری خوا تبارك وتعالى، وەك پێویست کەسایەتیی ئەو زاتە بەڕێزە دەناسێ، هەر بۆیەش ئێمە ناتوانین بەبێ زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمیی (إفراط وتفریط) تەماشای پێغەمبەری خوا بکەین و، هەڵس وکەوتێکی ڕاست ودروستی لەگەڵ بکەین، مەگەر لەحاڵێك دا کە کتێبی خوا بکەینە چراو بناغەو پێوەر.

ئاشکراشە: هەر کام لە لێ داشکاندن و لێ کەمکردنەوەی کەسایەتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و، هێنانەخواری لەو پێگەو پایەی خوای کاربەجێ بۆی دیاریی کردوە - بەهەر بیانوویەکەوە بێ- و، ڕۆچوون و تێپەڕاندن لە ڕێز لێگرتن و بە مەزنگرتنی داو، بەرزترکردنەوەی لەو ئاستەی خوای بەرزو مەزن بۆی داناوە، هەردووکیان هەر هەڵەو لادانن:

**یەکەمیان:** کەمتەرخەمیی و کورتهێنانە، لەوەدا کە بۆی شایستەیە ولێی دەوەشێتەوە.

**دووەمیشیان:** زێدەڕۆیی وتێپەڕاندنە لەو سنوورە کە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا، دانراوە.

دیارە هەردووکیشیان بێڕێزییەکی مەزنن، کە خاوەنەکانیان شایستەی سزان.

شایانی باسیشە هەندێك[1] نەزانی خۆبەزانازان گومانیان بردوە کە: تێپەڕاندن و زێدەڕۆیی لە بەمەزنگرتنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) پەسندە، یان لێبوردراوە!

**وەك ئەو هەموو هۆشداریی دانانە (تحذيرات)ی پێغەمبەری خوایان لەو بوارەدا نەبیستبێ، وەك:**

١- {**لا تُطْروني كما أَطْرَتِ النّصارى عيسى ابن مريم، فإنَّما أنا عبدالله، ولكن قولوا: عبدالله ورسوله**} رواه البخاري: ٦٤٦٥.

واتە: وەك نەصرانییەکان لە مەدحی عیسای کوڕی مەریەم دا تێیان پەڕاند، لە مەدحکردنم دا زێدەڕۆیی مەکەن، بێگومان من بەندەی خوام، بەڵام بڵێن: بەندەو ڕەوانەکراوی خوا.

٢- {**اللهم لاتَجْعل قبري وَثناً، لعَنَ الله قَوماً اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد**} رواه أحمد: ٧٣٥٢ وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده قويٌّ.

واتە: ئەی خوایە! با گۆڕەکەم نەبێتە بت، نەفرینی خوا لەکۆمەڵێك بێ، کە گۆڕی پێغەمبەرانیان کردنە مزگەوت.

٣- {**اللَّهم لاتجعل قبري وثناً يُعْبَد**} رواه مالك: ٥٩٣، وصحّحه الألباني في المشكاة: ٧٥٠.

واتە: ئەی خوایە! با گۆڕەکەم نەبێتە صەنەمێك بپەرسترێ.

٤-{**لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد**} رواه البخاري: ١٣٦٥ ومسلم: ١٢١٢.

واتە: نەفرینی خوا لە جوولەکە و نەصرانییەکان بێ، گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان کردنە مزگەوت.

---

(١) صۆفییەکانیش بەگشتی لەو بوارەدا لە هەموو کەس زیاتر گیرۆدەی تێپەڕاندن بوون و، گەلێك جاران زێدەڕۆیی کردنیان لە بەمەزنگرتنی پێغەمبەر، بگرە تەنانەت شێخەکانیشیان دا، سەری پێ بەشیرك گەیاندوون، کە لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بکەم بۆ ئەو قەصیدەیەی بە (البُرْدة) ناسراوە، کە (البوصيري) لەمەدحی پێغەمبەردا هۆنیویەتەوەو، لەشیعرێکی دا دەڵێ: {ومن علومه علم اللوح والقلم} کە هەرچی خوا لە (اللوح المحفوظ)دا تۆماری کردوە، بەبەشێك لەزانیاری پێغەمبەری خوای دەزانێ! کە دیارە ئەوەش نەزانییەکی مەزنە بەرانبەر بەخوای بێ هاوتا.

بەڵام پێویستە بزانرێ کە وەك چۆن تێپەڕاندن لە بەمەزن گرتن (تعظیم) ی پێغەمبەری خوادا، (صلى الله عليه وسلم) سەرزەنشتکراو (مذموم)ە‌و، بگرە جاری وایە سەردەکێشێ بۆ شیرك، کە بریتیە لەو ستەمە مەزنەی هەرگیز خوا نایبووری، بەهەمان شێوەش کەمتەرخەمیی کردن لەڕێز لێگرتن و ئەدەب نواندن بەرانبەری دا - بەبیانووی ترسان لە کەوتنە نێو زێدەڕۆیی- دیسان سەرزەنشتکراوە، بەڵکو جاری وایە سەردەکێشێ بۆ کوفر و دەرچوون لەبازنەی ئیسلام، یان لانی کەم: هەڵوەشاندنەوەی کردەوان (حبوط الأعمال) وەك ئایەتی (٢) ی (الحجرات) بەڕوونیی دەیگەیەنێ.

ئنجا ئەوەش کە مرۆڤ لە کەوتنە هەردوو چاڵی تێپەڕاندن و بەزایەدان دەپارێزێ، لە تێڕوانین بۆ کەسایەتیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، هەڵس وکەوتکردن لەگەڵی دا، بریتیە لە توند دەستپێوەگرتنی کتێبی خوا، کە بریتیە لەو تەرازووە وردەی، هەموو شتەکان لەشوێنی شایستەی خۆیان دا دادەنێ، بەبێ هەڵکشان وداکشان.

**ئنجا بەکردنە بناغەی ئەوەی ڕابرد، دەڵێین:**

هیچ گومانی تێدا نیە کە لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێبازو سیرەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێویستە بۆ هەر کەسێك بیەوێ شارەزای ژیان و گوزەرانی پێغەمبەرو، چۆنیەتی جێبەجێکردنی بۆ کتێبی خوا و، پەروەردەکردنی بۆ هاوەڵانی و، بنیاتنانی بۆ کۆمەڵگا و، دامەزراندنی بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، ببێ.

هەروەها لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێبازی پێغەمبەرەوە، بۆ زۆر مەبەستی دیکەش پێویستە وەك: پەیبردن بەهۆکار و بەسەرهاتی دابەزینی زۆرێك لە ئایەت و سووڕەتە بەپێزەکانی قورئان، کە یارمەتی مرۆڤ دەدات، بۆ چاکتر لێتێگەیشتنی ئەو ئایەت و سووڕەتە موبارەکانە.

هەروەها وەك: پەیبردن بەڕەوشت و ئەدەبە بەرزو ناوازەکانی پێغەمبەر لە کتێبەکانی سوننەت وسیرەدا.. جگە لەوانەش لە ئامانج و پاڵنەرە شەرعییەکان،

بەڵام لێرەدا ڕاستییەكی گرنگ هەیە لەبواری لێكۆڵینەوە، دەربارەی ڕێبازی پێغەمبەر، پێویستە وریای بین، ئەویش ئەوەیە كە:

مرۆڤ ناتوانێ بەشێوەیەكی ڕاست ودروست لەئایینی خوا تبارك وتعالى تێبگات، ئەگەر سەرەتا بەكتێبی خوا دەست پێ نەكات و، پاشان بگوازێتەوە بۆ كتێبەكانی سوننەت، ئەویش لەبەر زۆر هۆكاران، لەوانە:

**یەكەم:** بێگومان قسە لەقەدەر قسەكەرە (الكلام على قدر المتكلم)، ئنجا كتێبی خواش، ئەو فەرمایشتەیەتی كە بۆ پێغەمبەری خاتەمی ناردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ التوبة: ٦

ئنجا ئاشكراشە كە ئەو ڕووناكیی و ڕەونەقەی فەرمایشتی خوای بەدیهێنەر هەیەتی، هەرگیز قسەی غەیری خوا، نەك هەر نایگاتێ، بگرە هەر تێشیدا بەشدار نیە، هەر كەس بێ و هەرچۆن بێ، خوای پایەبەرز فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴾ النساء: ١٧٤.

**دووەم:** تەنیا كتێبی بەپێزی خوا، توانای ڕوونكردنەوەی سەرجەم ڕاستییەكانی هەیە، تێكڕای ئەو ڕاستییانەی كە مرۆڤەكان پێویستیانن، لەم ژیانە دنیاییەیان دا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

١- ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ النحل: ٨٩.

٢- ﴿ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ يوسف: ١١١.

**سێیەم:** تەنیا کتێبی خوا چارەسەری تەواوی سەرجەم دەردو نەخۆشییە جۆراو جۆرەکانی مرۆڤەکانی گرتۆتەخۆی: فیکریی بن، یان ڕووحیی، یان کۆمەڵایەتیی، یان سیاسیی. هتد، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

١- ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ الإسراء: ٨٢.

٢- ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ يونس: ٥٧.

**چوارەم:** لەڕووی سەنەدیشەوە کتێبی خوا، هەمووی یەك پلەیە، کە بریتیە لە تەواتوری دڵنیاکەر (التواتر اليقيني)، چونکە دوای ئەوەی خوا سبحانه وتعالى لەڕێی فریشتەی ئەمینداری خۆی (المَلَك الأمين) (جبریل)ەوە، دایبەزاندۆتە سەر دڵی موبارەکی کۆتایی پێغەمبەران (علیه الصلاه والسلام)، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء: ١٩٢ - ١٩٥.

بەڵێ، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا وەریگرت، بەسەر دەیان، پاشان سەدان، دوایی هەزاران کەس لە هاوەڵانی دا خوا لێیان ڕازی بێ، خوێندیەوە، هەروەها ئەوانیش بەزارەکیی و بە نووسین (شفاهاً و كتابة) گەیاندیان بە هەزاران لە شوێنکەوتووان (تابعین) خوا لێیان خۆشبێ، هەروەها بەو شێوەیە، هەتا ئەم ڕۆژگارەی ئێستامان.

بەڵام بێگومان سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەمووی بەو جۆرە نیە، بەڵکو لەڕووی سەنەدەوە جۆراوجۆر و پلەپلەیە، - وەك لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد-.

**پێنجەم:** ئنجا ئەگەر گریمان سوننەتی پێغەمبەرمان بەڕاڤەو ڕوونکردنەوە (شرح وتفسیر)و، قورئانی مەزنمان بە مەتن (متن)یش دانا - کە ئەمە بەڕەهایی ڕاست نیە، وەك پێشتر باسمان کرد - ئەوە شتێکی زانراوە، کە لەدوای خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی مەتن، نەبێ، ناگونجێ لە شەرح و تەفسیر، بکۆڵینەوەو لێی تێبگەین!

**بەمەبەستی زیاتر ڕوونبوونەوەی ئەم بابەتە گەورەو گرنگەش، دەڵێین:**

شتێکی زانراوە - بۆشارەزایانی قورئان - کە کتیبی خوای کاربەجێ، ئەندازەی گرنگیی دانی بە بابەتەکان و، تەرخانکردنی پانتایی پێویستی ئایەتەکانی بۆ هەر کامێکیان، بەئەندازەی گرنگیی بابەتەکەو، پێویستیی بەندەکان بەزانین و پەیپێبردنی، دابەشکردوە.

بۆ وێنـە: لە کتێبی خوای کاربەجێ دا، گەورەترین پانتایی (مساحە) بۆباسکردن لەبارەی خواوە تبارك وتعالى، تەرخان کراوە:

چ وەك پێناسەی زاتی، کە هیچ شتێك وەك وێنەی نیە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ یەکەمین و دوامین و ئاشکراو پەنهانە: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾.

چ وەك ڕوونکردنەوەی ناوە هەرە باشەکانی وسیفەتە هەر بەرزەکانی.

چ وەك خستنەڕووی کارەکانی: لە دروستکردن و، ئەندازەگیریی و، مشوورگێڕیی و، ڕێنمایی کردن وگومڕاکردن و، ژیاندن ومراندن، زیندووکردنەوەو، سزاو پاداشت دانەوەو...هتد.

چ وەك بڕوا پێ هێنانی، کە تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکە.

چ وەك پەرستن و بەندایەتیی بۆکردنی، کە پەروەردگارو پەرستراوو سەرپەرشتیارو فەرمانڕەوایەو، لەهیچ ڕووێکەوە هیچ هاوبەشی نین.

دیارە سوورەتە مەککەییەکان کە نیزیکەی دوو لەسەر سێ (٣/٢)ی قورئانی مەزن پێك دێنن، هەموویان، یان زۆربەیان لەسوورگەی ئەم بابەتە گرنگەدا دەخولێنەوە، کە پانتایی گەورەتری تەرخانکراویشی لە بەسەرهاتی پێغەمبەران لەگەڵ گەل وکۆمەڵگایەکانیان و، وێنە هێنانەوەکان (ضرب الأمثال)دا، بەرجەستەیە.

**هەروەها بابەتەکانی دیکەش، وەك:**

بڕوا هێنان بەڕۆژی دوایی و مەسەلە پەیوەندییدارەکانی، لە ڕووداوە جۆراو جۆرەکانی: (ساعة) و (قيامة).

بڕوا هێنان بەوەحی و پێغەمبەرایەتیی و پێغەمبەران (عليهم الصلاة).

بڕوا هێنان بەفریشتان و بەجندان.

ژیانی مرۆڤ وجند لەم سەرزەوییەو حیکمەتەکەی و، ئەو سەرەنجامەی کە بۆلای دەچن.

**پاشان ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ بەتاك وکۆمەڵەوە، لەبوارەکانی:**

بووناسیی (معرفة الوجود) وتێڕوانین و، خواپەرستیی و، ڕەوشت و، بەهاکان وپێوەرەکان (القيم والموازين) و، دروشمەکان و، ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان و، پێکهێنانی خێزان و، بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو، ڕێکخستنی کاروبارەکانی دەوڵەت لەڕووی سیاسەتی نێوخۆو دەرەوەو، ئابووریی و، بانگەوازو ڕاگەیاندن و، سزا شەرعییەکان و، جەنگ وبەرگریی کردن و. سەرەنجام بەرپرسیارێتیی دەوڵەت لەبەرانبەر بانگەوازی ئیسلامیی دا و، گەیاندنی پەیامی ئیسلام بەخەڵك و، ئەوەی کە دەیخوازێ لە زەمینەسازیی و لابردنی کۆسپ و لەمپەرەکانی ڕێی بانگەواز، لەمیانەی جموجۆڵە سیاسیی و دیبلۆماسییەکان و، بەستنی پەیماننامەکان و...هتددا.

هەموو ئەو بابەتانەی بەکورتیی ئاماژەمان پێدان، کتێبی خوای کاربەجێ مافی دادگەرانەی خۆیانی پێداون و، گرنگیی شایستەی پێداون.

هەر بۆیەش لەکاتێکدا، مرۆڤ لەم ڕاستییانەی کتێبی خوا تێردەبێ و، بەقووڵاییەکانی دا دەچێتە خوارێ، بۆ پەیبردن بە نهێنییەکانی و، بەڕووناکییەکانی کتێبی بەپێزی خوا، عەقڵ و دڵی ڕۆشن دەبێتەوە، لەوکاتەدا تێگەیشتنێکی ڕاست وگشتگیرو قووڵی بۆ ئایینی حەقی خوای بۆ دەستەبەر دەبێ و، تێڕوانینێکی هاوسەنگی بۆ بەرنامەی تێرو تەواوو هاوسەنگیی خوای، بۆ فەڕاهەم دێ، بەجۆرێك كە لایەنێكی بەسەر لایەنێكی دا زاڵ نابێ و، بەشێكی لەسەر حیسابی بەشەکانی دیکەی گەورەو قەبە ناکرێ، کەسەرەنجام جوانیی خوارسکیی ئایینی خواو، ڕێك وپێکیی یە دڵڕفێنەکەی - كە کتێبی مەزنی خوا - پێیداوە، تێکبچێ!

بەڵام ڕێبازی خاوەن شەرەف (السنّة الشريفة) بەو جۆرە نیە، چونکە پێغەمبەری لێزان (صلى الله عليه وسلم) کەمتر وابووە ئەو لایەنانە ڕوون بکاتەوە، کە لە کتێبی خوادا بەڕوون وئاشکرایی خۆر لەنێوەڕاستی ئاسمان دا، هاتوون، بەتایبەت ئەو بابەتە بنەڕەتییانەی، کە قورئان خەمێکی تایبەتی لێ خواردووە و، زۆری بایەخ پێداون، وەك بابەتەکانی: بووناسیی و، ئیمان و، خواپەرستیی، بەچەمك و واتای فراوان وگشتگیریان.

بەڵێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك مەسەلەی جوزئیی ڕوونکردوونەوە، بەڵام ئەو ڕوونکردنەوانەی پێغەمبەر لەوە دەرناچن کە: زیاتر شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتانە بن، کە حیکمەتی خوا وایخواستوە، بەکورتیی یان تەنانەت بەئاماژەو هێما، لە قورئان دا باسبکرێن.

بەڵام -وەك پێشتریش باسمان کرد- ئەو بوارەی کە سوننەت ڕوونکردنەوەو، تیشکی زیاتر خستنەسەری، بەئەستۆوە گرتوە، بریتیە لەبواری جێ بەجێ کردنی کردەیی ئایینی خوای کاربەجێ و زانا، لەهەردووك لایەنی سەرەکیی:

دروشمەکانی خواپەرستیی و، بەرنامەکانی ژیان وگوزەران (الشعائر التعبّدية و الشرائع الحياتية)دا.

هەربۆیەش هەرکەسێك بەر لەتێربوون لەڕاستییەکانی قورئان و، عەقڵ و دڵ ڕۆشن بوونەوە بەڕووناکییەکانی، سەرگەرمی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ، بەلێکۆڵینەوەو لەبەرکردنی مەتنەکان وسەنەدەکان (حفظ المتون والأسانيد) و، بەدواداچوون وجێ بەجێ کردنی هەندێك لە وردە بابەتەکانی، ئەوە بێگومان ئەو تێگەیشتنە ڕاست و گشتگیرو، تێروانینە هاوسەنگ وتێرو تەواوەی بۆ ئایین وبەرنامەی خواو، ڕێبازو ڕێ وشوێنی پێغەمبەری خوا، چنگ ناکەوێ -بەو چەمکەی کە هەڵمان بژارد- کە کتێبی قسە لەجێی خوای زاناو توانا، پێمان دەبەخشێ، دیارە ئەوەش نەك بەهۆی کەم وکوڕییەوە لە ڕێبازی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، بەڵکو بەهۆی نەچوونە ماڵەکان لە دەرگاکانی خۆیانەوە (عدم إتيان البيوت من أبوابها)!

چونکە ئەو ڕیزبەندییە هەڵگەڕاوەیە (الترتيب المقلوب) - سەرگەرمبوون بە سوننەتەوە (بەچەمکە زاراوەییەکەی) پێش لێتێگەیشتنی کتێبی خواو تێراو بوون بەڕاستییەکانی - پێچەوانەی هەرکام لە قورئانی حەکیم و ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێزە:

١- پێچەوانەی قورئانە، چونکە خوای بەرز، لەچوار شوێنان لە قورئانێ دا، ئەرکی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) لەچوار شتان دا پوخت کردۆتەوە:

١) خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا (تلاوة آيات الله).
٢) تەزکیەکردنی خەڵك (التزكية).
٣) فێرکردنی کتێب (تعليم الكتاب).
٤) فێرکردنی حیکمەت (تعليم الحكمة).

وەك لەهەردووك ئایەتی (١٢٩ و ١٥١)ی (البقرة) و، ئایەتی (١٦٤)ی (آل عمران)و، ئایەتی (٢)ی (الجمعة)دا هاتوە، ئنجا لەهەر چوار شوێنەکەدا خوێندنەوەی ئایەتەکان ( يتلوا عليهم ) پێش سێ کارەکەی دیکەی خراوە، کەواتە: یەکەمین کاری پێغەمبەری بەڕێزو، ئەرکە بنەڕەتییەکەی، لە خوێندنەوەی کتێبی موبارەکی خواو، ئایەتەکانی بەسەر خەڵك دا، بەرجەستە

دەبێ، بۆیە ئێمەش پێویستە لەپرۆسەی فێربوون وفێرکردنی ئایین دا، لەو شوێنەوە دەست پێبکەین، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لێیەوە دەستی پێ کردوە، چونکە بەدڵنیاییەوە، ئەو لەهەموو کەس بە ئایینی خوا شارەزاتر بووەو، لەهەمووشیان بۆ خوا پارێزکارتر بووە، پاشان ئەو سەرمەشقی ئیماندارانە:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب: ٢١

هیچ کەسیش بۆی نیە لە ڕێبازو پەیڕەوەکەی لابدات.

٢- هەروەها ئەو ڕیزبەندییە پێچەوانەی سوننەتە، چونکە:

وەك لەڕابردوودا خستمانەڕوو، کتێبی خوا، ڕووح وبناغەی ڕێبازی پێغەمبەری خوایە، لەسۆنگەی ئەوەوە کە فەرمایشت وکردەوەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): جگە لەڕوونکردنەوەی هەندێ شت کە لە قورئان دا بەکورتیی باسکراون و، ڕوونکردنەوەو بەرجەستەکردنی چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی کتێبی خواو، دابەزاندنی بۆسەر زەوی واقیع، شتێکی دیکە نیە.

بەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەباشترین شێوە فەرمانی خوای بەرزی:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل: [1]٤٤

جێ بەجێ کردوە، لەمیانەی ڕێبازو سیرەی خۆی دا، چونکە بێگومان ڕێبازو ژیان وسیرەی وی، لەماوەی بیست وسێ (٢٣) ساڵ دا و بەهەردووك قۆناغی مەککەیی و مەدینەیی یەوە، جگە لەجووڵان بەکتێبی خوای بەرز، لە هەموو مەیدانەکانی: بوونناسیی و ئیمان و خواپەرستیی و ڕەوشت و ئاکارو خێزان و کۆمەڵایەتیی وسیاسی و...هتددا، شتێکی دیکە نەبووە، ئاشکراشە کە

---

(١) واتە: زیکر (قورئان)مان بۆ لات دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆلای خەڵکی دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە {چۆن جێ بەجێ دەکرێ؟} بەڵکو خۆیشیان بیربکەنەوە و لە قورئانەوە ڕامێنن).

ئێمەش بەئەندازەی ئەوە کە وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەچین و بەڕێی ویدا دەچین و، شوێن پێی هەڵدەگرین و، ڕێنمایی یەکەی وەردەگرین - هەرکەسە بەپێی خۆی و لەقەدەر خۆی- بەو ئاوات و ئامانجانە دەگەین، کە ئەو پێیان گەیشتوە.

حەزیش دەکەم کۆتایی ئەم باسی پێنجەمە، بەم تێبینییە بێنم:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و کردنی بە پێشڕەو وسەرمەشق، بەرهەمی ئیمان پێ هێنانیەتی و، یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیمان پێ هێنانی، بریتیە لە خۆشترویستنی لەهەموو کەس و هەموو شتێك زیاتر، هەروەها ڕێزلێگرتنی و حورمەت بۆدانانی، وەك شایستەی ئەو پایەو پێگە بەرزەیەتی کە خوا بۆی داناوەو، لەکتێبی بەڕێزی خۆی دا دیاریی کردوە، لەبەرئەوە، شوێنکەوتنی مرۆڤ بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەگوێرەی بەهێزیی وبێهێزیی ئیمانەکەی دەبێ و، هەتا مرۆڤ بڕوای بەپێغەمبەری خوا پتەوتربێ، شوێنکەوتنی بۆی و چاولێکردنی زیاترو باشتر دەبێ، هەروەها بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

هەر بۆیەش خوا سبحانە وتعالى بڕواهێنان بە پێغەمبەری، خستۆتە پێش ڕێزلێگرتنی و پشتگرتنی و شوێنکەوتنی، وەك خوا عز وجل لە وەسفی شوێنکەوتووە سەرفرازەکانی دا فەرموویەتی:

﴿..فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ الأعراف: ١٥٧.

هەروەها لەبەرانبەریش دا: هەتا شوێنکەوتنی مرۆڤ بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تێرو تەواوتر بێ، بڕوا پێبوونی و لێ نیزیکبوونی چاکترو تەواوتر دەبێ، چونکە لەنێوان ئیمان وکردەوەیەك دا، کە بەرهەم و شوێنەواریەتی، کارلێکی دووسەرە (تأثير متبادل) هەیەو، هەرکامیان کار لەوی دیکە دەکات و بەهێزی دەکات.

## باسی شەشەم

### بوار و مەیدانەکانی
### شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا

پێشتر - لە باسی چوارەم دا - باسمان کرد کە شوێنکەوتنی مرۆڤ بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و، وەرگرتنی ڕێنمایی یەکەی و گرتنی ڕێبازەکەی، بەتەواو دانانرێ، مەگەر گشتگیربێ و سەرجەم لایەنەکانی ڕێبازو ڕێ وشوێنەکەی بگرێتەوە:

بوونناسیی، ئیمان، خواپەرستیی، پارێزکاریی، تەزکیەی نەفس، ڕەوشت و ئاکار، مامەڵە جۆراوجۆرەکان، بانگەواز، فەرمان بەپەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، جەنگ وجیهاد، حوکم وسیاسەت، دادوەریی...هتد.

ئنجا ئێستا تیشك دەخەینەسەر ئەم بابەتە، لە دە (١٠) لایەنەوە، لەبەر تیشکی ڕووناکیی چەند ئایەتێکی بەپێزی قورئان دا:

#### یەکەم: بواری بوونناسیی (معرفة الوجود):

کە مەبەست پێی چۆنیەتی تێڕوانینە بۆ بوون (وجود) بە بەدیهێنەرو بەدیهێنراو (الخالق والمخلوق)ەوە، شتێکی ئاشکراشە کە پێغەمبەری خاتەم، جگە لە کتێبی خواو ئەو وەحییەی کە تاکە زانیاریی ڕاستی دڵنیاکەری لەبارەی بوون

(وجود)ەوە، گرتۆتە خۆی، هیچ سەرچاوەیەكی دیكەی زانیاریی لەبەردەست دانەبووە، وەك فەرموودەی خوا ئاماژەی بۆ دەكات:

﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ الشرح:١-٣

چونكە مەبەست لە سینەگوشادبوون (شرح الصَّدر)ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و لابردنی ئەو قورسایی یەی پشتی گران كردبوو - هەر خواش زانای كاربەجێیە - ڕووناك بوونەوەی عەقڵ و دڵی موبارەكیەتی، بەزانیاریی و شارەزایی ڕاست و دروست لەبارەی بوونەوە، كە وای لێكرد نهێنیی و حیكمەتی بوون (وجود) بەگشتی و، بوون و ژیانی دنیایی مرۆڤ بەتایبەت، بزانێ، چونكە بەمسۆگەریی: پێغەمبەری خاتەم بەرلەوەی خوای بەخشەر بەرێنمایی خۆی سینەی گوشاد بكات، لەتەنگانەو نارەحەتییەتی مەزن دابووە، لەبواری دەرك كردنی نهێنی بوون وحیكمەتی ژیان، بەبەڵگەی چوونە خەڵوەی چەندان شەوو ڕۆژەیەوە، لەئەشكەوتی حیرا و (غارُ حِراء)دا بۆ ڕامان و پەرستش، بەڵام هەر لەگەڵ ڕووناكیی وەحی و كتێبی خوا، بەردڵی موبارەكی كەوت، یەكسەر قورسایی ئەو نارەحەتیی و سەختییەی سەر سینەو پشتی لاچوو، كە بێگومان بەبێ ڕۆشنایی وەحی خوا، نەدەگونجا لابچێ!

كەواتە: هەر كەس شوێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بكەوێ، ئەوە بووناسیی وتێڕوانینی خۆی لەبارەی بوون (وجود)ەوە، لەهەمان سەرچاوەوە هەڵدەهێنجێ، كە پێغەمبەری خوا لێیەوە هەڵیهێنجاوە.

## دووەم: بواری ئیمان (مجال الإيمان):

هەروەها لەم بوارەش دا موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بێجگە لەكتێبی خوا، سەرچاوەیەكی دیكەی نەبووە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ الشورى: ٥٢.

بەڵێ (محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب) هیچی لەبارەی ئیمانەوە نەزانیوە، هەتا خوا عز وجل بەپێغەمبەرو ڕەوانەکراو هەڵیبژاردو، کتێب و وەحی خۆی پێدا و، سەرەنجام دڵی موبارەکی بەڕۆشنایی وەحی شوعلەوەر بوو، هەروەها بوو بەسەرچاوەی ڕووناکیی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی.

هەربۆیەش پێغەمبەری نەخوێندەوار (علیه أفضل الصلوات وأتم التسلیمات وأفضل البرکات)، تەنیا خۆی سەرمەشق وچاوساغی ئەهلی ئیمانە، لەبواری ئیمان دا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ البقرة: ٢٨٥.

## سێیەم: بواری خواپەرستیی (مجال العبادة):

هەروەها لەبواری خواپەرستییش دا -بەهەردووك چەمكی گشتی وتایبەتیی- كە كتێبی خوا بەكورتیی بنەمایەكانی وجۆرەكانی خستوونەڕوو و، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بەڕێبازی موبارەكی وردەكارییەكانی و چۆنیەتییەكانی ڕوون كردوونەوە، پێغەمبەری خاتەم تاكە سەرمەشقە كە دەبێ پەیڕەویی لێ بكرێ، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا، خواپەرستیی بەگشتی و دروشمەكانی لە: نوێژو زیكرو پاڕانەوەو ڕۆژوو و حەج و...هتد لە سوننەتی خۆیدا بەباشترین شێوە ڕوون كردۆتەوە، خوا سبحانه وتعالی لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾

الأنعام: ١٦١ - ١٦٢

بەڵێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەکەمین مسوڵمانی ئۆممەتەکەیەتی لەڕووی کاتییەوە، یەکەمین مسوڵمانە بەڕەهایی لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیی لەڕووی پلەو پێگەوە، دیارە مسوڵمانەتیی ویش (صلی الله علیه وسلم) لە بەندایەتیی تێرو تەواوی دا بۆ خوا بەرجەستەیەو، خواپەرستیی تێرو تەواویش، تەنیا کاتێك دێتەدی، کە دروشمەکان تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێن، کە نوێژ و ڕۆژوو و حەج گرنگترین جۆرنی، هەروەها کە ژیان و مردن بەس بۆ خوای بەرز و بەپێی ڕەزامەندیی وی بن، کە دیارە ئەوەش تەنیا بۆ کەسێك مەیسەر دەبێ، کە پابەندی شەریعەتی خواو ئایینە ڕاست ودروستەکەی بێ و، بیکاتە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی و، لەسەری بژی و لەسەری بمری.

کەواتە: هەرکەسێك شوێن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەوێ، دەبێ ڕێبازی وی بگرێ، لەپەرستنی خوای بەرزدا: لەهەردووك بواری دروشمەکان و بەرنامەکان (الشّعائر والشرائع)دا.

## چوارەم: بواری پارێزکاریی (مجال التقوی):

بوارێکی دیکە کە دەبێ بابای شوێنکەوتووی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تێیدا شوێن پێی پێغەمبەر هەڵبگرێ و بیکاتە سەرمەشقی، بواری پارێزکارییە، خوای بەرزیش فەرمانی بە هەرکام لە پێغەمبەرەکەی و ئۆممەتەکەی کردوە، بە پارێزکاریی، وەك فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ الأحزاب: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ آل عمران: ١٠٢

هەڵبەتە پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەسۆنگەی ئەوەوە کە زاناترین کەس بووە بەخوا و، لێترساوترینیان بووەو، پارێزکارترینیان بووە بۆی، وەك فەرموویەتی:

{...والله إني لأخشاكم لله ، وأتقاكم لَهُ} رواه البخاري: ٥٠٦٣ ، ومسلم: ١٤٠١.

بۆیە ئەو زاتە پێشەوای تێکڕای پارێزکاران و باشترین سەرمەشقیانە.

## پێنجەم: بواری ڕەوشتی بەرز و پەسند (مجال حسن الخلق):

ڕەوشتی بەرز و پەسندیش بوارێکی دیکەی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواو گرتنی ڕێبازەکەیەتی، کە خوا لە وەسفی ئەو زاتەدا فەرموویەتی:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ۝٤﴾ القلم: ٤

واتە: بێگومان تۆ (ئەی موحەممەد!) لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، پێشتریش باسمانکرد: کە دایکی بڕواداران (عائشە) ڕەوشتی پێغەمبەری خوای بەمجۆرە پێناسە کردوە: {كان خُلُق نبي الله القرآن}، هەر بۆیە ئێمەش ئەگەر بمانەوێ باش شوێن پێغەمبەری خوا بکەوین، لە ڕەوشت و ئاکاریدا و، لە ئەدەبی بەرزیدا، پێویستە چاو ببڕینە قوڕئان و بیکەینە ئامانجمان.

شایانی باسیشە زۆربەی خەڵکی تەنیا لایەنی ڕەوشت - بەچەمکە تەسکەکەی - لەم ئایەتە موبارەکە دەفامنەوە:

﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ الأحزاب: ٢١

بەڵام بێگومان ئەوە تێگەیشتنێکی کەم وکورت و تەنگەبەرە، کە هیچ بەڵگەیەك پشتگیریی ناکات چونکە خوا بەڕەهایی فەرموویەتی: کە پێغەمبەر چاکترین سەرمەشقە بۆ بڕواداران و، چەمکی سەرمەشق (مفهوم الأُسوة) بەهیچ شتێك بەندار (مُقَآد) نەکراوە، بۆیە پێویستە لەسەر ڕەهایی خۆی بهێڵرێتەوەو، چەمکە گشتگیرەکەی بۆ هەرچی خێرو چاکەیە - یانی: سەرجەم ئایینی خوا - بەرتەسك و گچکە نەکرێتەوە.

## شەشەم: بواری هەڵس وکەوت (مجال التعامل):

ئەمیش بوارێکی دیکەیە لەو بوارانەی کە پێویستە پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) تێدا بکەینە سەرمەشق و، شوێن ڕێبازەکەی بکەوین، هەڵبەتە چەمکی هەڵس وکەوت (تعامل)یش لەچەمکی ڕەوشت (خُلُق) فراوانترە، لەو ڕووەوە کە گشتگیرە بۆ سەرجەم هەڵس وکەوت و ڕەفتارەکانی مرۆڤ لەگەڵ خەڵك دا، بەڵام لەو ڕووەوە کە تایبەتە بەلایەنی کردەیی یەوە، بەرتەسك ترە.

دیارە ئایەتی زۆریش هەن، کە پەیوەستن بەچۆنیەتی هەڵس وکەوتکردنی پێغەمبەری لێزان، لەگەڵ خەڵکیدا، بەهەموو جۆرەکانیانەوە: بڕواداران و کافران.

کافرانیش: شەڕفرۆشان، هاوپەیمانان، بێ لایەنان.

هەروەها: هاوبەشدانەران، خاوەن کتێبان، موونافیقان.

**ئەمیش چەند ئایەتێك لەو بوارەدا کە تەنیا بە نووسینیان وازدێنین و قسەیان لەبارەوە ناکەین:**

١- هەڵس وکەوت لەگەڵ بڕواداران دا:

١- ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ آل عمران: ١٥٩.

٢- ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١٢٨.

**٢- هەڵس وکەوت لەگەڵ کافران دا، خاوەن کتێب و هاوبەشدانەران:**

**یــەك: شەڕفرۆشان، یان پەیمان شکێنان:**

١- ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الأنفال: ٥٥ - ٥٨.

٢- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾ الأنفال: ٦٥.

٣- ﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ النساء: ٨٤.

**دوو: پابەندان بەپەیمانەوە، یان بێلایەنان:**

١- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ التوبة: ٤.

٢- ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ النحل: ٩١.

٣- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَـٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَـٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾ النساء: ٩٠.

**سێ: ئامادەبووان بۆ سەرانەدان و، مانەوە لەسەر ئایینی خۆیان:**

﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾ التوبة: ٢٩.

**٣- هەڵس وکەوت لەگەڵ موونافیقان دا:**

١- ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ المنافقون: ٤

٢- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ التوبة: ٧٣

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ التحريم: ٩.

## حەوتەم: بواری بانگەواز بۆلای خوا (مجال الدعوة إلى الله):

حەوتەمین بواری شوێنکەوتنی پێغەمبەرو گرتنی ڕێبازەکەی، بریتیە لەبواری بانگەواز بۆلای خوای بەخشندەی میهرەبان، وەك خوای تاك وپاك بەپێغەمبەری خاتەمی فەرمووە:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ يوسف: ١٠٨.

## هەشتەم: بواری فەرمان بەپەسند و ڕێگریی لە ناپەسند (مجال الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر):

خوای زانا وشارەزا هەرکام لە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) و ئۆممەتەکەی بەو سیفەتە مەزنە پێناسە کردوون، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الأعراف: ١٥٧.

٢- ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ آل عمران: ١٠٤.

## نۆیەم: بواری جەنگ وجیهاد (مجال القتال والجهاد):

نۆیەمین بوار کە دەبێ مسوڵمانان تێیدا شوێن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەون و بیکەنە سەرمەشقیان، بریتیە لە جەنگ وجیهاد لەڕێی خوادا، شایانی باسیشە کە ئەو ئایەتەی باسی پێغەمبەری خوا کردنە سەرمەشق دەکات، لەسیاقی چەند ئایەتێك دا هاتوە، کە باسی جەنگ وجیهاد دەکەن:

﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾ الأحزاب: ٢٠ - ٢٣.

خوای بەرزیش مەدحی ئەو بڕوادارانەی کردوە، کە لەکاتی قەیران و سەغڵەتیی دا، لەمەیدانی جەنگ وجیهاد دا شوێن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوتوون:

﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١١٧.

## دەیەم: بواری حوکمڕانیی و دادوەریی (مجال الحكم والقضاء):

ئەمیش بوارێکی دیکەی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و گرتنی ڕێبازەکەیەتی، چونکە خوای دادگەر فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی و، بە شوێنکەوتووە بڕوادارەکانیشی کردوە، کە حوکم لەنێوان خەڵکی دا بکەن بەو بەرنامەیە کە خوا ناردوویەتە خوار و بەدادگەرانە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴾ النساء: ١٠٥.

٢- ﴿ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾ المائدة: ٤٢.

٣- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾ النساء: ٥٨.

ئێستاش لەکۆتایی ئەم باسی شەشەمەدا -پێم وایە- زیاتر لەوبارەوە بەرچاومان ڕوون بۆوە کە ئەو قسەیە ڕاستە، کە دەڵێ:

کتێبی بەرێزی خوا عز وجل بناغە و بڕبڕەی پشتی سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، چونکە وەك ڕوونمان کردەوە: پێغەمبەری خوا لە هەموو بوارەکانی دینداریی و خواپەرستیی دا کە ئێمە لە دە (١٠) بواردا پوختمان کردەوە، تەنیا شوێن کتێبی موبارەکی خوای کاربەجێ کەوتوەو، ئاڕاستەکانی جێ بەجێ کردوون.

**لە کۆتایی ئەم بەشەش دا، سەرنجتان بۆ سێ مەسەلان ڕادەکێشم، بەڵام زۆر بەکورتیی:**

**یەکەم:** مەبەست لە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ کتێبی خوای بەرزو مەزن، شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی هەندێك لەو بابەتانەیە، کە بەکورتیی لە قورئان دا باسکراون، بەتایبەت بابەتە کردەیی یەکانی وەك: نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و، چۆنیەتی ئەنجامدانیان و، چۆنیەتی جێ بەجێ کردن (تطبیق)ی ئایین و بەرنامەی خوا بەگشتی لەسەر ئەرزی واقیع و، گۆڕین وچاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگا، کە دیارە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بەکردەوە هەر وای کردوە.

بێگومان مەبەست لەو ڕوونکردنەوەیە (تبیین)ی کە لەلایەن خواوە فەرمانی پێکراوە:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ النحل: ٤٤.

شەرح و تەفسیری سەرجەم کتێبی خوا نیە، چونکە:

١- ئەگەر مەبەست ئەوە بووایە، لەو ئایەتە موبارەکەدا، بەدڵنیایی یەوە پێغەمبەری خوا پێ ی هەڵدەستا و ئەنجامی دەداو، ئێمە ئێستا تەفسیری پێغەمبەری خوامان بۆ قورئان، لەبەردەست دەبوو!

٢- کتێبی خوا لەخودی خۆیدا بەگشتی ڕوون وئاشکرایە - بۆ خەڵکی خۆی -، وەك خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی:

١- ﴿طسٓمٓ ۝١ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝٢﴾ الشعراء: ١ - ٢.

٢- ﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ۝١﴾ هود: ١.

